




# پرشنگی ڕۆژی کوردەواری لە شەرحی بوخاری

بەرگی چوارەم

دانەر

مەلا حسین شیخ سعدی

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ

پاریزەر

بشیر حسین سعدی

# پڕشنگی ڕۆژی کوردەواری
# لە شەرحی بوخاری

بەرگی چوارەم

دانەر
مەلا حسین شیخ سعدی

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ
پاریزەر
بشیر حسین سعدی

لەساڵی ١٩٥٢ دانراوە



وێنەی دانەر
ملا حسین شێخ سەعدی
١٨٨٣ - ١٩٨٣

٤٩٦ عن سَعدٍ(ض) لا يكيدُ أهلَ المدينةِ أحدٌ إلا أنماعَ كما ينماعُ الملحُ في الماءِ

**تەرجەمە**

٤٩٦ دەگێڕنەوە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (خ.ل) لە پێغەمبەر(د) گوێم لێ بوو فەرمووی فێڵێك ناکا لە خەڵکی مەدینە بە (ناحەق) هیچ کەسێك ئیلا مەگەر دەتاوێتەوە وەکوو تاوانەوەی خێ لەناو ئاو.

٤٩٧ عن أسامةَ(ض) هَلْ تَرَونَ ما أرى إنّي لأرى مواقعَ الفتَن. خلالَ بيوتكُمْ كمواقع القَطْر

**تەرجەمە**

٤٩٧ دەگێڕنەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدی ئەنصاری(خ.ل) گوتی پێغەمبەر(د) بەسەر جێگایەکی بەرزکەوت لە بەرزاییەکانی مەدینە فەرمووی ئەری ئێوە دەبینن ئەوی من دەبینم بەڕاستی من دەبینم لە ناو خانووەکانتان جێگایەکانی پشکی بارانی فتنەو مصیبەتان کە لێ دەکەوون وەکوو بارانی ئاسمان.

(ش) ئەمە لە کوژرانی ئیمامی عوسمانو لە شەڕی - حەڕەی - مەنحوسە. کە چەند هەزار کەس کوژراو فەوتان

٤٩٨ عَنْ أبي بكرةَ (ض) لا يَدخُلُ المدينةَ رعْبُ المسيح الدجّال لها يومَئذٍ سبعةُ أبواب على كُلِّ بابٍ مَلَكانِ.

**تەرجەمە**

٤٩٨ دەگێڕنەوە لەنەفیع ئەبو بەکرەی کوڕی حارث کوڕی کە لدەی ثەقەفی (خ.ل) گوتی پێغەمبەر(د) فەرمووی ناچێتە ناو شاری مەدینە ترسو تەشویشاتی دەجال (دەجال پاشایەکی کافرە - ئەم ووشەیە لە (دەجەل) هاتووە بەواتا درۆیە. بۆیە ناوبراوە بە دەجال چونکی درۆزنەو عالەم

تێکەڵ یەکتری دەکا وە بەناو یەکتریان وەر دەکا بۆ فەساد. لە ڕۆژی مەسیحی دەجال بۆ مەدینە حەوت دەرگا هەیە لەسەر هەر دەرگایەك دوو مەلائکە ڕاوەستاوون دەی پارێزن لەفتنەی مەسیحی دەجال.

٤٩٩ عن أبي هريرةَ (ض) على انقاب المدينةِ ملائِكةٌ لا يدخُلُها الطّاعونُ ولا الدجّالُ.

## تەرجەمە

٤٩٩ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە(خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی لەسەر دەرگەو کونو کەلەنەکانی مەدینە مەلائکە هەیە ناچێتە ناو شاری مەدینە نەتاعونو ڕشانەوەو نە دەجال.
(ش) خودا ڕاستی پێغەمبەری خۆی بە دیار خست. بە قەطعی نەبیستراوە طاعون داخلی مەدینەی پیرۆز بووبێ.

٥٠٠ عَن أنسٍ (ض) ليسَ مِن بَلَدٍ إلاّ سَيَطَئوهُ الدجال الاّ مَكّةَ والمدينةَ ليسَ مِن نَقابها نُقبٌ الاّ عليه الملائكةُ صافينَ يحرسونها ثمّ ترجُفُ المدينةُ بأهلها ثلث رَجفاتٍ فيُخرِجُ اللهُ كُلَّ كافرٍ ومنافقٍ.

## تەرجەمە

٥٠٠ دەگێڕنەوە لە ئەنەس کوڕی مالك(خ.ل) ئەویش بە گێڕانەوە لە پێغەمبەر(د) فەرمووی نی‌یە هیچ شارێك مەگەر دەجال دەچێتە ناوی. تەنیا مەکەو مەدینە نەبێ نی‌یە لە هیچ دەرگەو کونو کەلەنی مەدینە مەنفەذێك. ئیلا مەگەر چەند جەماعەتی مەلائکە بەڕیز ڕاوەستاوون دەی پارێزن لە دەجال پاشان مەدینە دەلەرزی بەو خەڵکەی تیایەتی. بۆ ئەوەی کافرو منافقەکانی لەناو بڕوا سێ جاران. لە جاری سێ‌یەم خودا هەموو کافرو منافقی لەناو دەردەکا بۆ لای دەجال دەڕۆن پیاوی ئیمانداری دڵسۆزی تێدا دەمێنێتەوە. ئنجا بە ئەمینی لە دەست بەسەراگرتنی دەجال تێدا دەمینێنەوە دادەنیشن.

٥٠١ عن أبي سعيدٍ (ض) يأتي الدجّال وهو محرّمٌ عليه ان يدخُلَ نقابَ المدينَةَ ينزلُ بعض السباخ التي بالمدينة فيخرُجُ إليه يَومئذٍ رجُلٌ هُوَ خير الناس أومن خير الناسِ فيقول أشهدُ أنّكَ الدجالُ الذي حَدَّ ثنا عنكَ رسول الله (ص). حديثهُ. فيقولُ الدجالُ أرأيتَ إن قتلتُ هذا ثم أحيَيْتهُ هل تشكون في الامرِ فيقولونَ لا فيقتُلهُ ثم يُحييه فيقولُ حينَ يُحييهِ والله ماكُنْتُ قطُّ أشدَّ بصيرَةً مني اليومَ فيقولُ الدجال أقتلهُ فلاَ يُسلَّطُ عليه.

## تەرجەمە

٥٠١ دەگێڕنەوە لە ئەبو سەعیدی خودری(خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) لە باسی دەجال حەدیثێکی درێژی بۆ ئێمە گوتەوە. لەوەی کە باسیکرد ئەوە بوو. فەرمووی دەجال دێ لێشی حەرامە بچێتە ناو دەرگەو ڕێگەکانی کە دەچنە مەدینە.

لە دەرەوەی مەدینە لە هەندێ شۆڕەکاتەکەی مەدینە دا دەبەزێ. پاشان پیاوێکی لێ دەچێتە دەرێ کە ئەو باشتریخەڵکەیە یاخۆ فەرمووی لە باشتریخەڵکە. ئنجا پیاوەکە پێی دەڵێ من شاهیدی دەدەم بەبێشك تۆ ئەو دەجالەی، کە پێغەمبەری خودا خەبەری هاتنی تۆی بە ئێمە داوە لە کاتی هەبوونی خۆی. ئنجا دەجال دەڵێ بە ئەتباعەکانی خۆی ئەرێ پێم بڵێن ئەگەر من ئەم پیاوە بکوژم پاشان زیندووی بکەمەوە لە خوایەتی من شکتان دەمێنێ. جوولەکەو ئەهلی شەقاوەتەکان «واتا بەدکردارەکان» دەڵێن نا. ئنجا دەی کوژێ پاشان زیندووی دەکاتەوە. ئنجا پیاوەکە دەڵێ وەکوو زیندووی دەکاتەوە. وە الله لە حەیاتی خۆم لە ئیمڕۆ خۆم بە زاناتر نەدیوە. دەربارەی بیروباوەڕی ئایین. چونکی پێغەمبەر(د) فەرموویەتی دەجال پیاوی کوژراو زیندوو دەکاتەوە ئنجا بەم نیشانەیە بینایم زیاد بوو. ئنجا دەجال دەڵێ دەی کوژم پاشان دەجال نە ئەوو نە کەسێکی تری پێ ناکوژرێ هەموو توانایەکی بەتاڵ دەبێتەوە.

٥٠٢ عَنْ جابرٍ (ض) المدينةُ كاالكيرِ تُنفي خُبثَها وينصَعُ طيّبَها.

## تەرجەمە

٥٠٢ دەگێڕنەوە لە جابری سەلەمی گوتی عەرەبێکی بیابانشین. ناوی قەیسی

کوڕی حازمی منقری بوو. هاته خدمەت پێغەمبەر (د) بەیعەتی پێکرد لەسەر ئاینی ئیسلام. (واتا موسوڵمان بوو). بۆ سبەینێ تای هاتێو هاتەوە خدمەت پێغەمبەر. بە پێغەمبەری گوت. لە مەدینە هەڵم بگرە پێم ناکرێ وەکوو خەڵکی مەکە بە ناوی کۆچ کردوو (موهاجر) لە مەدینە دابنیشم لە بیابان نەبێ نازێم. استقالەی موبایەعەکەشم لێ قبوول بکەوە. مەبەستی هەڵگەڕانەوە نەبووە لە ئاینی ئیسلام بەم دەلیلە چونکی داوای موافەقەی پێغەمبەری کردووە. ئەگەر مەبەستی هەڵگەڕانەوە بوایە لە ئاینی ئیسلام جێ بەجێ دەی کوشت تا سێ جاران ئەم قسەیە ی دووبارە کردەوە جاری سێیەم پێغەمبەر (د) فەرمووی مەدینە وەکوو هەمبانە دەفی کوورەی ئاسنگرە سغو چلکو پیسی لا دەبا. پوختەو پاکژەکە دەمێلێتەوە (واتە فاسق قبوول ناکا).

٥٠٣ عن أنسٍ (ض) اللهمَّ اجعلْ بالمدينةِ ضِعْفَي ما جَعَلتَ بمكّةَ مِنَ البَرَكةِ.

**تەرجەمە**

٥٠٣ دەگێڕنەوە لە ئەنەس (خ.ل). ئەویش لە پێغەمبەر (د) گوێیان لێ بووە. فەرمووی ئەی خودایە دوو ئەوەندەی ئەو بەرەکەتی لە مەکە هەیە بیخەیە مەدینە. ئیمامی مالك ئەگەر چی لەم حەدیثە دەری هێناوە کە بەرەکەتی دونیایی‌و قیامەتی لە مەدینە زیاترە لەوەی کە لە مەکە هەیە بەڵام ئیمامەکانی مجتهد باوەڕیان بەوە نەکردوە چونکی هەموویان ڕێك کەوتوون لەسەر ئەوە کە خواپەرستی لە مەکە گەورەترە. گوتویانە ئەم حەدیثە هەر بۆ کاروباری دونیایە. بەگوێرەی ئەم حەدیثەی کەدێ. فەرمویتی (اللهم بارك في صاعِنا وفي مُدِنا.).

٥٠٤ عن عائشةَ (ض) اللهمَّ حبِّبْ الينا المدينةَ كَحُبّنا مكّةَ أو أشدَّ اللهُم بارك لنا في صاعنا وفي مُدِّنا وصحّحْها لنا وانقُلْ حُمّاها الى الجُحْفَةِ.

**تەرجەمە**

٥٠٤ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە فەرمووی وەکوو پێغەمبەری خودا چووە

مەدینە ئەبوبکرو بلال تایان دەهاتی. دەی گوت ئەی خودایە لەعنەت لە شەیبەی کوڕی رەبیعە وە ئومەیەی کوڕی خەلەف وە عوتبەی کوڕی رەبیعە بێ چلۆن لە وولاتی خۆمان کەمەکەیە. ئێمەیان خستە وولاتی ئاوو هەوای ناساز. پاشان پێغەمبەر(خ.ل) دوعای بۆ مەدینە کرد. فەرمووی ئەی خودایە مەدینەمان لا شیرینو خۆشەویست بکەی وەکوو خۆشەویستنمان بۆ مەکە. بەلکی زیاتر ئەی خودایە بەرەکەتو زێدەکی بخەیە ئەو خواردنانەی کە بە ڕبەکانمان دەیان پێوین وە ناسازیشی لەناو لابەی ناساغیو تایەکانیشی بکوێزیەوە بۆ (جوحفە). کە میقاتی حەجی خەلکی مصرە. بۆ گوازتنەوەی نەخۆشی ئەوێی دیارکرد چونکی ئەو کاتە ئەوێ خەلکەکەی کافر بوون. ئنجا خودای گەورە دوعای پێغەمبەری قبوول کرد حەزرەتی عائشە فەرموویتی ئێمە هاتینە مەدینە لە حاڵەتێکی کە ناسازگارترین ڕووی عارد مەدینە بوو. ئەوەی دیاربوو لە ـ بو طحان (شیوێکە لە دەشتی مەدینە) ئاوێکی زۆر لیڵو ناسازی لێ دەڕوێ. ئەوی دەردو بەلاو ناساغی بوو لە مەدینە هەمووی هەر دەیانگوت ئی ئەو ئاوەیە. لەپاش دوعای پێغەمبەر (د) ئەم ئاوە ناسازە ووشکبوو خودا مەدینەی کردە سازکارترین ڕووی عارد. ئنجا وەکوو ئەبوبەکری صدیق تای دەهاتێ لە گەرمەی تا یەکەدا دەی گوت بە هەڵبەست بە عەرەبی «كلُّ امرئ مصَبح في أهلِه * والموت ادنى من شراكِ نعْلِه» واتە هەموو کەس لەناو کەسو کاری خۆی مەرحەباو بەیانی باشی دەکرێ واتە بەرێزەو بێ قەدر نی‌یە بە تایبەتی لە کاتی نەخۆشی بەلام ئێمە چونکی لە مەدینە غەریبینو بێ خزمو کەسین گلەیی‌مان لە هیچ کەس نی‌یەکە حالیش وایە مردن لە هەمووکەس لە قەیتانی قۆندرەی نزیکترە یەعنی حەقی غەمناکیم نی‌یە چونکی غەریبو خەلکی نیشتمان ئاخری کاریان هەر مردنە وەکوو یەکتری.

بیلالیش ـ مەبەست بلالی حەبەشی‌یە ـ ڕەزای خوای لێ بێ وەکوو تا بەری دەداو لە یەقەی دەبووە دەیگوت بە عەرەبی (الا ليتَ شعري هَل أبيتَنّ لَيْلَه* بوادٍ وَحولي أذخَرٌ و جَليلُ) واتا ئەی خۆزیا بنوستمایە شەوێك دەورەشم بپۆشرایە بە ئەنخەرو گیای جەلیل.

وە هەروەها ئەم شیعرەشی دەگوت

(وَهَل أردَنْ يوماً مياه مَجَنَّةٍ * وَهَلْ يبدونَ لي شامةٌ وَطفَيلٌ) واتا: ئەرێ ئاخۆ ڕۆژێك دەبێ بچمە سەر ئاوەکانی ـ مەجنە) لە ناحیەی (مرّ الظهرانه) نزیکە لە مەکە. ئایا دەبێ ڕۆژێك دوو کێوەکانی شامەو طفیل ببینم وە بۆم بەدیار بکەون.

پوخنەی قسە ئەوەیە لەبەر ئازاری ئایەکانی کە لە مەدینە تووشیان هاتبوو عەریبی مەکەیان کردووە بۆیە بەسەر عاردو کێوو ئاوەکانی وولاتی مەککەی دا هەلکوتووە. شرقاوی جـ٢ لاپەرە (٤٣).

## كتاب الصيام

## باسی رِۆژوو

## بسم الله الرحمن الرحيم

## بە ناوی خودای بەخشندەی بەرِەحم

٥٠٥ عن أبي هريرةَ (ض) الصيام جُنَّةٌ فلا يَرفُثْ ولا يجهَلْ إن امرؤٌ قاتَلهُ أو شاتمهُ فليقلْ إني صائمٌ مَرتينِ والذي نفسي بيدهِ لخلوفُ فم الصائمِ أطيبُ عند اللهِ من ريح المسكِ يتركُ طعامهُ وشرابهُ وشهوتهُ من أجْلي الصيام لي وانا أجزي بهِ. والحسنةُ بعشْرِ أمثالها.

### تەرجەمە

٥٠٥ دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە بە رِۆژوو بوون مەتالو خۆ پارستنە لە گوناهانو لە ئاگر ئنجا ئاگر کەسێکی بەرِۆژوو بێ با قسەی ناشیرین نەکا کە بێ شەرعی بێ. وە با فشەو گالەگالّ نەکا وە ئەگەر پیاوێك بەربەرەکانی لەگەلّ کرد یاخۆ شەرە جوێنی لەگەلّ کرد با دووجار بلّێ من بەرِۆژووم (یەعنی من ئیمساکم کردووە لە هەموو خواردنو خواردنەوەی خۆش پێویستە لە ئارەزووی شەرِە جوێنو شەرِکردن خۆم بپارێزم بە هەقی ئەو زاتەی کە رووحی منی بەدەستە بۆنی دەمی گۆراوی ئەو کەسەی بەرِۆژوو بێ، خۆشترە لای خوا لە بۆنی میسك خودا فەرمووی ئەو کەسی بەرِۆژووە لە خۆی قەدەغە دەکا خواردنو خواردنەوەو جووت بوون (جماع) لەگەلّ ئافرەتی خۆی لەبەرمنو منیش تۆلّەی بۆ دەکەمەوە لە پاداشو چاکە وە هەر چاکەیەکێش لای کەمی یەك بە دەیە.

(ش) بێگومان ئەوەی بەخشندەش بێ چاکە لەگەل خەلّك بکا مالّ بداتە هەزار چاکەکەی بێ حسابە چونکە بە حساب بێ حساب بۆ ئەو وەکوو

یەکە.
ذاتی خودای گەورەش بە گوێرەی حەدیثی (ان الله یحب الامور العالِیةَ ویکرَه سفسافها) هەر حەزی لە کاری بالاّو بەرزە. خۆ بالاّترینی ئەم دوو شتە وەکوو یەکەش لای خودا جەهەتی پاداشی بێ حسابە. کەوایە فەرموودەکەی شەرقاوی کە فەرمووی دوو چەندانەکەی چاکەدانەوە بێ حسابە زۆر جوانو شیرینە. ئەگەر بە اعتراض بگوترێ چلۆن بۆنی دەمی بەرۆژوو خۆشترە لای خودا لە بۆنی میسك.
کە بێنی خوێنی شەهیدیش. بێنی میسکە لە گەڵ ئەوەی کە رووحی خۆی فیدای ئاینی خودا کردووە. جواب دراوەتەوە بۆیێ بێنی ئەثەری رۆژوو خۆشترە لە بۆنی ئەثەری (شوێنەواری) شەهید. کە ئەویش خوێنەکەی تی. چونکی رۆژوو یەکێکە لە ئەرکانی ئیسلام کە حەدیثی (بُنيَ الاسلامُ علی خمسٍ ...الخ) باس کرا وە چونکی جیهادیش فەرزی کفایەیە رۆژووش فەرزی عەینە. فەرزی عەینیش پێشتر خراوە لەسەر قسەی (راجع) ئەمە ئیمامی شافعي وای گوتووە. امام الحرمینیش لەسەر پێچەوانەی ئەمەیە نووسەری ئەم دێرانەش (واتە دانەری ئەم پەرتووکە) لەبەر حەدیثی (رجعنا من الجهاد الاصغر الی الجهاد الاکبر). قسەی ئیمامی شافعی پێ راستە ئەم قسەی امامی شافعی بە چاکتر دەزانێ خودا لەوانو لە ئێمە خۆشبێ.

٥٠٦ عَن سَهلٍ (ض) إنَّ في الجنّةِ باباً يقالُ له الرّيّانُ يدخلُ منه الصائمون يومَ القيامة لا يدخلُ منهُ أحدٌ غيْرَهُم يقالُ أينَ الصائمون فيقومون لا يدخل منهُ احدٌ غيرهُم فاذا دَخلوا أُغْلِقَ فلم يدخل مِنهُ أحدٌ.

## تەرجەمە

٥٠٦ دەگێرنەوە لە سەهل (ر.خ) ئەویش لە پێغەمبەر دەگێڕێتەوە (د.خ) فەرمووی بەراستی لە بەهەشت دەرگەیەك هەیە پێی دەگوترێ (رەیان) رۆژی قیامەت هەر کەسێ بەرۆژوو بووبێ لەو دەرگەیە دەچێتە ناو بەهەشت بێجکە لەوان کەس لەو دەرگەیە ناچێتە ناو بەهەشت.
دەگوترێ لە کوێنە ئەوانی بەرۆژوو بووینە لە دونیا. ئنجا هەڵ دەستن غەیری ئەوان لەو دەرگەیە کەس ناچێتە ژووری بەهەشت پاشان وەکوو چوونە ژوورێ کلیل دەدرێ بێ لەوانەی کە پێشان داخل کراوون کە

کۆمەڵی بەڕۆژووان بوون هیچ کەسی تر داخل ناکرێ.

٥٠٧ عنْ أبي هُريرةَ (ض) مَنْ أنفقَ زَوجين في سبيل الله نودي من أبواب الجنةِ يا عَبْدَالله هذا خيرٌ فمن كان مِن أهلِ الصلاة دُعيَ من باب الصلاة ومن كان من أهلِ الجهاد دُعيَ مِن باب الجهاد ومن كان من اهل الصيام دُعي من باب الريّان. ومَنْ كانَ من اهل الصَدَقة دعي من باب الصدَقةِ فقالَ ابوبكر (ض) بأبي أنت وأمّي يا رسول الله ما على من دُعي مِن تلك الابواب من ضرورَةٍ فهل يُدعى أحدٌ من تلك الابواب كلها فقال نعم وارجو ان تكونَ مِنهم.

## تەرجەمە

٥٠٧ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە (ر.خ) بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەر کەسێك سەرف بکا دووشت وەکوو دوومەڕ یا دوو ووشتر یا دوو درهەم لەهەر شتێك هەبێ لە ڕێگای خودا گاز دەکرێ لە دەرگەیێك لە دەرگەکانی بەهەشت ئەی بەندەی خودا ئەمە باشترە. ئنجا کەسێك ئەگەر ئەهلی نوێژ بووبێ لەفەرزو سونەت درێغی نەکردبێ لە دەرگەی نوێژ بانگ دەکرێ وە ئەگەر کەسێك ئەهلی جهاد بێ لە دەرگەی جهاد بانگ دەکرێ وە ئەگەر کەسێك ئەهلی ڕۆژوو بووبێ لە دەرگەی رەیان بانگ دەکرێ حەزرەتی ئەبووبکریش ڕەزای خودای لێبێ عەرزی کرد بابو داکم بە فیدات بێ ئایا چی لەسەر هەیە کەسێك لە هەموو دەرگان بانگ بکرێ ئایا دەبێ کەسێك لە هەموو دەرگەکان بانگ بکرێ پێغەمبەر(د) فەرمووی بەڵێ ڕەجاو ئومێدم وایە تۆ لەوان بێ حەزرەتی ئەبوبەکریش بۆیە ئەم پرسیارەی کرد مەبەستی ئەمەبوو شتێکی وابکا لە خوا پەرستیو طاعەت کەلە هەموو دەرگا بانگ بکرێ ئەگەر چی هەر لەیەك دەرگایشی داخل دەبێ بەلام کە بانگی دەکرێ لە هەموو دەرگا لەبەر ڕێزگرتنەو لەبەر بە گەورە زانینە.

٥٠٨ عن أبي هُريرةَ (رض) إذا دَخَلَ رَمضانُ فُتحَتْ أبوابُ السماء وغُلِقَتْ أبوابُ جهنمَ وسُلسِلتِ الشياطينُ.

## تەرجەمە

٥٠٨ دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە (ر.خ) پێغەمبەر(د) فەرمووی وەکوو مانگی ڕەمەزان داهات ـ دەرگەکانی ئاسمان ـ یەعنی بەهەشت. دەکرێنەوە وە کلیلیش دەدرێن دەرگەکانی جەهەنەم شەیتانەکانیش بە زنجیر دەبەسترێنەوە.

٥٠٩ عنْ أبي هُريرةَ (ض) إذا جاءَ رمضان فُتِحَتْ ابوابُ الجَنَّةِ.

## تەرجەمە

٥٠٩ دەگێرنەوە لە ئەبوو هورەیرە(ر.خ) پێغەمبەر(د) فەرمووی وەکوو ڕەمەزان داهات دەرگەکانی بەهەشت والا دەکرێنەوە (بە نیشانەی هاتنی مانگی ڕەمەزان بۆ مەلائکە). یاخۆ لەبەر بەگەورە زانینی ئەم مانگە پیرۆزە.

ئەمە دەلیلەو بەڵگەیە کە دەرگەکانی بەهەشت لە کاتەکانی تر کلیل دراوون.

٥١٠ عن إبنِ عمر (ض) إذا رأيتموه فصوموا وإذا رأيتموه فأفطِروا فأن غُمَّ عليكم فاقدُروا له. وفي رواية لِهلالِ رمضان.

## تەرجەمە

٥١٠ دەگێرنەوە لە عبداللهی کوڕی عومەر (ر.خ) گوتی گوێم لێبوو لە پێغەمبەر(د) دەی فەرموو وەکو مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانتان دیت بە ڕۆژوو بن (ئنجا با یەك کەسیش دیتبیّ) لەلای یەك لە دوو قەولی شافعی لای قازی شاهیدی بدا. لای (بەغەوی)و هەندێ زانای تریش واجب دەبێ ڕۆژوو لەسەر کەسێك پیاوێکی باوەڕ پێکراو خەبەری دیتنی مانگی دابی بانەش چوو بیتە لای قازی) وەکوو مانگی یەك شەوەی شەوالیشتان دیت ڕۆژوو بشکێنن پاشان ئەگەر لێتان بووە هەور تەواوکردنی سی ڕۆژی ڕەمەزان دابنێن بە جەژن. تەواوکردنی سی ڕۆژی شەعبان دابنێن بە دەست پێ کردنی ڕەمەزان.

٥١١ عن أبي هريرةَ (ض) مَن قامَ رمضان إيماناً واحتساباً غُفِرَ لهُ ما تقدَّم من ذنبهِ وفي روايةٍ عنه أيضاً من صامَ.

## تەرجەمە

٥١١ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە(ر.خ). پێغەمبەر(د) فەرمووی هەر کەسێك بەشەو لە رەمەزان هەڵستێ بە باوەڕی‌و اعتقاد بۆ خواپەرستی‌و تەراویح. خودا لە هەموو گوناهی پێشووی خۆش دەبێ لە ریوایەتێکی تریش لە جیاتی مَن قامَ (من صامَ) گوتراوە. ئەوەی لەم دوو حەدیثە پیرۆزە دەردەکەوێ خودای گەورە بەهۆی هەستانەوەو بەڕۆژوو بوون لە رەمەزان لە هەموو گوناهێك دەی بووریٚ لە گوناهی گەورەو بچووك‌و مافی خوداو مافی خەڵکی بەڵام زانا گەورەکان هەر چەندە مافی خەڵك‌و گوناهی گەورەیان جودا کردیتەوە واتە خودا لەمانە خۆش نابێ بەڵام کەرەمی خوداوەندی عالەم لەسەرەوەی اجتهادو بۆچوونی زانایانە مەرحەمەت‌و لێبوردنیشی‌فرەوانترە لە هەر شتێکی کەتۆ زۆر بە گەورەی دەزانی بە گوێرەی پێشکەوتنی مەرحەمەتی خودا لە تووڕە بوونی. مەرحەمەت زووتر دەگاتە گوناهکار. یاخودا بمانگێڕی لەوانەی هەڵدەستنەوە لە رەمەزان‌و بەڕۆژوو دەبن وە حەشرمان بکەی لەگەڵ پێغەمبەران‌و خۆشەویستانی خۆت بە گەورەیی خۆت یا رەحمان. آمین.

٥١٢ عن ابي هُريرةَ (ض) مَن لم يدعْ قولَ الزّورِ والعَمَل به فليسَ للّهِ حاجةٌ في أن يَدَعَ طعامَهُ وشرابَهُ.

## تەرجەمە

٥١٢ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە(ر.خ) گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) هەر کەسێك تەرك نەکا قسەی درۆو بوختان‌و غەیبەت‌و جوێن تەرکیش نەکا کارکردن بەوانە خودا بێ نیازە لە تەرك کردنی خواردن‌و خواردنەوەی ئەو کەسە واتە رۆژوو بە قسەی ناحەق کردن پاداشتی کەم دەبێ مەعنای وانی‌یە رۆژوو بەتاڵ دەبێ پاشان فلیس لَهُ حاجَةٌ مەعنای وانی‌یە بابە رۆژوو نەبێ. بەڵکی مەبەست ئاگادار کردنەوەو ترساندنە لە قسەی بێ‌شەرعی ـ هەر وەکوو (حەدیثە) فەرموویتی (مَن باعَ الخمرَ فَلْيُشَقِّصْ

الخنازيرَ). يەعنی هەر كەسێك شەراب بفرۆشی بابەرازیش بكوژێتەوە ـ خۆ مەبەستی پێغەمبەر(د) ئەمرو فەرمان كردن نی‌یە بە كوشتنەوەی بەراز بەڵكی مەبەستی نەكردنە لە فرۆشتنی شەراب. یەعنی با شەراب نەفرۆشی چونكی گوناهێكی زۆر گەورەیە.

٥١٣ عن أبي هريرةَ (ض) قال الله تعالى كُلّ عمل ابن آدم له الاّ الصيامَ فانهُ لي وانا أجزي به. للصائم فرحتان يُفرحُهما اذا أفطر فَرِحَ واذا لَقِيَ ربهُ فرِحَ بصومِهِ

## تەرجەمە

٥١٣ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە (ر.خ) پێغەمبەر(د) فەرمووی فەرموودەی خودایە ـ گەورەیی هەر بۆ ئەوە ـ هەموو كاری مرۆڤ بۆ خۆیەتی ڕۆژوو نەبێ چونكی ئەو بۆ منە وەمنیش تۆڵەی ڕۆژووی بۆ دەكەمەوە. بۆ خاوەن ڕۆژوو.
دوو كەیف خۆشی هەیە بەهەردوویان كەیف خۆش دەبێ. شادمانی‌یەك لە دونیا وەكوو ڕۆژوو دەشكێنێ. شادمانی‌یەكیش لە قیامەت وەكوو دەگاتە خدمەت خودای خۆی بە پاداشتی ڕۆژوەكەی كەیف خۆش دەبێ.

٥١٤ عن عبدالله (ض) من استطاع الباءَةَ فليتزوج فانهُ أغضُّ لِلبَصرِ وأحصنُ للفرج ومن لَمْ يستَطع فعليهِ بالصومِ فانّهُ له وِجاءٌ.

## تەرجەمە

٥١٤ دەگێڕنەوە لە عبداللەی كوڕی مەسعود(ر.خ) گوتی لە خدمەت پێغەمبەر بووین (د) فەرمووی هەر كەسێك بتوانێ ـ جماع ـ بكا واتە جووت بێ لەگەڵ ئافرەتو تواناى مەسرەفی ژن هێنانی هەبێ ـ با ژن بێنێ چونكی ژن هێنان باشتر تەمەعی چاو دەبڕێ لە ئافرەتانو باشتر ـ ئالەت ـ واتە ئەندامی نێرینەی پیاو دەپارێزی لە زینا. وە ئەوی پێشی ناكرێ ژن بێنی لەبەر هەژاری با بەڕۆژوو بێ چونكی ڕۆژوو بۆ ئەو شەهوەت دەبڕێ گوتراوە بە پێچەوانە ڕۆژوو چونكی گەرمی لە لەشی مرۆڤ زیاد دەكا گەرماییش شەهوەت بە جوولە دەخا. وەڵام دراوەتەوە بەڵێ لە

سەرەتاوە وایە بەلاَم وەکوو ڕۆژووی کردە نەریتو عادەت. شەهوەت دادەمرکێو ساکن دەبێ.

٥١٥ عن إبن عمر (ض) الشهرُ تِسعٌ وعشرون ليلةً فلا تصوموا حتّى تَرَوْهُ فان غُمَّ عليكم فأكمِلوا العِدةَ ثلاثينَ.

## تەرجەمە

٥١٥ دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر (ر.خ). بەڕاستی پێغەمبەر فەرمووی مانگ هەیە بیستو نۆ شەوە. بە ڕۆژووش مەبن هەتا مانگی یك شەوە دەبینن. پاشان ئەگەر بەری مانگ لە ئێوە هەوور بوو إعتباری مانگی شەعبان بکەن بە سی شەوە.
(ش) وا دەبی هەتا سێ مانگ لە دوو یەکتری بیستو نۆ بیستو نۆ دەبێ بەلاَم لە چوار هەورازی چوار نابی.

٥١٦ عن أمّ سَلمةُ (ض) انّ الشهر يكونُ تِسعةٌ وعشرين يوماً.

## تەرجەمە

٥١٦ دەگێڕنەوە لە ئومی سەلەمەی دایکی ئیمانداران (ر.خ) گوتی پێغەمبەر (د) سوێندی خوارد کە یەك مانگ نەچیتە حوجرەکانی ئافرەتەکانی خۆی. وەکوو بیستو نۆ ڕۆژ چوو دانی سبەینە. یاخۆ دانی هیوارە بوو چووە لایان عەرزی کرا تۆ سوێندت خوارد یك مانگ نەچی‌یە لایان. پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی وا دەبێ بیستو نۆ ڕۆژو شەو بێ. بەڕاستی ئەو مانگیش بە بیستو نۆ شەوی دیترا.

٥١٧ عن أبي بكرةَ (ض) شهران لا ينقصان. شهرا عيدٍ. رمضانُ وذو الحجّةِ.

## تەرجەمە

٥١٧ دەگێڕنەوە لە نەفیعی ئەبی بەکرەتە (ر.خ). ئەویش لە پێغەمبەری گوێ لێ ببوو فەرمووی دوو مانگ کۆنابنەوە لەسەر کەمی دوو مانگی جیژنان

- یەکیان ڕەمەزان. دووەم ذي الحجە. (یەعنی نابی لە یەك ساڵ هەردوویان بیستو نۆ بن.)

٥١٨ عن ابن عمَرَ (ض) إنا أمةٌ. أمِيَّةٌ. لا نكتبُ ولا نحسبُ الشهر هكذا. وهكذا يعني مرَّةً تِسعةً وعشرينَ ومَرةً ثلاثين.

## تەرجەمە

٥١٨ دەگێڕنەوە لە کوڕی عومەر (ر.خ). ئەویش لە پێغەمبەر دەگێڕێتەوە فەرمووی بەڕاستی ئومەتێکی بێ خوێندەوارین واتە چلۆن لە دایکمان بووین ئەوهاین. خاوەنی نووسین نین. حسابو سەرگوزەشتەو ڕەووشتی ئەستێرانیش نازانین (موکەلەفیش نین بۆ زانینی ڕۆژانی مانگ نووسینو زانیاری ئەستێرانیش بزانین). چونکی مانگ واش دەبێ یەعنی پێغەمبەر (د) جارەکیان سێ جار ئەنگوستی هەردوو دەستی پیرۆزی والا کردوتەوە بە ئیشارە وە باڵ سی دەفعەیێکیش ئەنگوستی ابهامی قوچاندووە بە اشارەوە باڵ بیستو نۆ (یەعنی زانینی ڕۆژانی مانگ کارێکی ئاسانە هەندێ جار سی دەبێ هەندێ جاریش بیستو نۆ.

٥١٩ عَنْ أبي هُرَيْرَةَ ( رض) لايتَقَدَّمَنَّ أحَدُكُمْ رَمَضانَ بِصَومِ يَوْمٍ أو يَوْمَيْنِ. ألاّ أنْ يَكوْنَ رَجُلٌ كانَ يَصومُ صَوْمَهُ فليَصُمْ ذلِكَ اليَوْمَ.

## تەرجەمە

٥١٩ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر(د) فەرمووی نەکا یەکێك لەئێوە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ لەپێش ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ نەوەك بۆ ڕەمەزان بێ تاقەت بێ مەگەر بۆ کەسێك دائما عادەتی وابێ لەوان ڕۆژان بە ڕۆژوو ببێ بۆ ئەو قەی ناکا بۆ پاراستنی نەریتی خۆی بابەڕۆژوو بێ.

(ش) لەمەزهەبی شافعی لەبەر ئەم حەدیثە ـ یوم الشك ـ واتا ئەو ڕۆژەی هەندێك بلێن ڕەمەزانە هەندێك بلێن ڕەمەزان نی یە ـ دروست نی یە ـ بەڕۆژوو بێ. وەلەنیوەی دوایی مانگی شەعبان حەرامە لەبەر حەدیثی ئەبو داوود (أذا أنتصَفَ شعبانً فلاتصوموا) ئیمامی نەوەویش لە (مەجموع) وای گوتووە. بەلام دەلێ ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبێ کە بلێ مادام پازدەی شەعبان بەڕۆژوو بووم با شازدەش بەڕۆژوو بم. لای ئیمامی ئەعزەمیش کەئەبی حەنیفەیە تەنیا یوم الشك مەکرووهە واتە پەسند نی یە کەتیایدا بەڕۆژوو بێ.

٥٢٠ عَنْ عَديّ ابنِ حاتِمٍ (ض) إنّما ذالِكَ سوادُ الّليْلِ وَبَياضُ النهارِ.

## تەرجەمە

٥٢٠ دەگێڕنەوە لە عودەی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بی). گوتی وەکوو هاتە خوارێ ئەم ئایەتە (حتّى يَتَبيّنَ لَكُم الخَيطُ الابيضُ من الخيطِ الاسوَد). چووم گوریسێکی ڕەشم هیناو گوریسێکی سپیشم هینا لەبن سەرینی خۆم دانا. ئنجا تەماشای شەووم دەکرد هیچم بۆ دیار نەبوو. خەیطی سپی ورەش چی یە. سبەینی زوو چوومە خدمەت ئەشرەفی عالەم (د) ئەم قسەیەم عەرزکرد فەرمووی مەبەستی ئایەت ڕەشایی شەوەو سپیاتی بەیانە.

٥٢١ عَن أنس ابن مالكٍ - تَسَحّروا فانَّ في السّحورِ بَرَكةً.

## تەرجەمە

٢٢١ دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالك ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی بخۆن و بخۆنەوە کەمێك لە پێش بەیان چونکی بەبێ گومان لەپاش شێو خواردن دا بەرەکەت و زیدەکی و چاکە هەیە.

٥٢٢ عَن سَلمَةَ بنِ الاكْوَعْ (ض) انَّ مَن اكَلَ فليتِمَّ أو فَلْيَصُمْ وَمَنْ لَمْ يأكُلْ فلا يأكُلْ.

## تەرجەمە

٥٢٢ دەگێڕنەوە لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ڕەزای خودای لێ بێ. بەڕاستی پێغەمبەر (د) هیندی کوڕی ئەسمائەی کوڕی حارثەی ئەسلەمی نارد بانگ بکا لەناو خەلکی لەڕۆژی عاشورا بەم تەرزە هەر کەسێك لەم ڕۆژە عاشورایە ئەگەر شتێکی خواردووە باهیچی تر نەخوا هەتا ئێوارە با إمساك بکا وە هەر کەسێکیش هیچی نەخواردوە باهیچ نەخوا هەتا ئێوارە.
(ش) ئەبو حەنیفە إستدلالی کردووە
(واتە ئەمەی کردوە بەڵگە) بەم حەدیثە لە ڕۆژووی فەرزیش جائزە نیەت بینی لەڕۆژێدا بەڵام بەدوو دەلیل قسەی ڕەدکراوە. یەکی‌یان ئەمە إمساکە ڕۆژوو نی‌یە (دووەم) ڕۆژووی عاشورا بەقەطعی فەرز نەبووە لای جمهور. پاشان جمهور أستدلالی کردووە بۆ ئەمە کە نی‌یەت دەبی

لەشەو دابی لەڕۆژووی فەرز بەحەدیثی حەفصە لای ئەصحاب. سونەنی ئەبی داوود کە پێغەمبەر (د) فەرموویەتی (مَن لم یُبَیّت الصیام من اللیل فلا صیام لهُ) ئەوەی دیارە لەم حەدیثە ئەگەر چی عامە لە فەرزو نەفل بەلام مەبەست هەر فەرز بووە بە قەرینەی حەدیثی عائشە کەڕابورا پێغەمبەر (د) بە عائشەی گوت (هَلْ عندکم من غداء قالت لا قال فأنّي صائم).

٥٢٣ عَن أبي هُریْرَةَ (ض)، إذا نسِي فأكَلَ وشرِبْ فليُتِمَّ صَوْمَهُ فأنّما أطعمهُ اللهُ وسَقاهُ.

## تەرجەمە

٥٢٣. دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی مرۆڤی بەڕۆژوو ئەگەر لەبیری چوو کەبە ڕۆژووە ئنجا خواردی وخواردیەوە بارۆژوەکەی خۆی تەواو بکا. بەڕاستی ئەم خواردنو خواردنەوەیەکە بە لە بیر چوون بووە خواردنێکو خواردنەوەیەکە خودا پێی داوە ڕۆژوەکەشی قازانج.

٥٢٤ عَن أبي هُریرَةَ (ض) مالكَ هَلْ تجِدُ رَقَبَةً تُعتقُها قالَ لا قال فهل تستطیعُ أن تصومَ شهریْنِ متتابعین. قال لا فقالَ هل تجدُ إطعامَ ستین مسکیناً قال لا. قال فمکثَ عندَ النبيِّ صَلی الله تعالی علیه وسلم فبینا نحنُ علی ذلك أُتِیَ النبي صلی الله تعالی علیه وسلم بِعَرَقٍ فیه تمرٌ قالَ أینَ السّائِلُ فقالَ أنا قال خذ هذا فتصدَّق به فقال الرَّجُلُ أعلی افقرَ مِنّي یا رسول الله فوَ الله مٰابینَ لا بَتَیها یُریدُ الحرَّتیْنِ أهلُ بیتٍ أفقرَ مِنْ أهل بیتي فضحكَ النبيُّ صلی الله تعالی علیه وسلم حتی بَدَت أنیابُهُ ثُمَّ قالَ اطعِمْهُ أهْلك

## تەرجەمە

٥٢٤ دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بێ ــ گوتی وەقتێك ئێمە دانیشتبووین لە خدمەت پێغەمبەر (د) لەناکاو عەرەبێکی دەشت نشین هاتە خدمەت پێغەمبەر(د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا فەوتامو بەفیلاك چووم.
فەرمووی چیت بەسەر هاتووە گوتی لەڕەمەزان بەڕۆژوو بوویمە

- چوومەلای ئافرەتی خۆم جماعم لەگەل کرد ـ واتە لەگەلی جووت بووم ـ پێغەمبەر (د) فەرمووی بەندەیەکت هەیە ئازادی بکەی گوتی نا. فەرمووی دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەکتری بە رۆژوبیی گوتی (نا) فەرمووی خواردنی شەست هەژارت هەیە گوتی (نا) ئەبوو هوورەیرە گوتی عەرەبەکە لەخدمەت پێغەمبەر (د) دەوامی کرد دەختێك کاتەك ئێمە لەوحالە دابووین زەنبیلە خورمایەکی گەورەیان بۆ پێغەمبەر هێنا فەرمووی سائلەکە واتە ئەوەی پرسیاری دەکرد لە کوێ یە؟ پیاوەکی عەرەب گوتی منم فەرمووی بگرە ئەو زەنبیلە خورمایە بچۆ بیدە هەژاران پیاوەکە گوتی چما دەفەرمووی بیدەمە یەکێك لەخۆم هەژارتر ئەی پێغەمبەری خودا.؟. سوێند دەخۆم بەخودا لەبەینی ئەو دوو عاردە چەقێنەی بەبەردرەش کەمەیینەی لە ناوە مالێك نی یە لەمالی ئێمە هەژارتر پێغەمبەر (د) پێکەنی هەتاشا ددانی پیرۆزی بەدیارکەوت. پاشان فەرمووی بچۆ دەرخواردەی خێزان ومندالەکانی خۆتی بدە.

(ش) ئەك بەجهەتی کەفارە بەلکی بەجهەتی تەملیك چونکی پیاو ئەگەر لەبەر فەقیری توانای ئازاد کردنی بەندەو عەبدی نەبوو. لەبەر بێ هێزیش توانای ئەوەی نەبوو دوو مانگ لەسەر یەکتری بەرۆژووبیی فەرمووی برۆ بیدە خاووخێزانەکەت. بەلام کەفارەکەی هەر لەئەمە دا ما. ئەوەی لەحەدیث دیارە کەفارە هەرلەسەر پیاوەکەیە لەسەر ژنەکەنی یە ئیمامی شافعی بەمە حوکمی کردووە ئیمامی ـ حەنەفیش حوکمی بە واجب بوونی کەفارە کردوە لەسەر ژنەکەش ئەگەر بەخۆشی خۆی رازی بووبی کەئەم کارەی لەگەلدا بکا. ئیمامی مالکیش گوتیتی ئەگەر کەسێك جماع لەگەل جاریەی خوی دا بکا لەرەمەزان دووکەفارەی لەسەرە یەکی یان لەجیاتی خۆی یەکی یان لەجیاتی جاریەکەی بابەخۆشی خۆشی بووبێ جاریەکە.

وەکوو جاریە دەبی لەجیاتی ئافرەتی خۆشی کەفارە بدا ئەگەر بەزۆر بووبێ. لازم نی یە ئافرەت کەفارە بدا ئەگەر عوزری هەبێ وا دەزاندرێ لەم حەدیثە کەسێك گوناحێك بکا حەدی تیانەبێ. بۆ أستغفتاش بێ سزا نادرێ چونکی سزادان دەبیتە نەکردنی أستغفتاو لێ پرسینە وە. وەکوو تووشی گوناهەکە بوو ئەمەش خراپەیەکی گەورەیە دەبی ئەم خراپەیە نەهێلدرێ بکرێ لە کرمانی دەلی هەندێ زانایانی ئایین هەزار مەسئلەیان لەم حەدیثە هەلێنجاوە یاخۆ زیاتر.

٥٢٥ عن ابن أبي أوفى (ض) إنزِلْ. فاجدَحْ لي إنزِلْ فاجدَحْ لي

انزِلْ فاجدَحْ لي إذا رأيتمُ الليْلَ أقبلَ مِن هيهنا فقد أفْطَرَ الصّائم.

## تەرجەمە

٥٢٥ دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی ئەبو ئەوفی (ڕزای خودای لێ بی) گوتی لەسەفەرێك لەخدمەت پێغەمبەر بووین فەرمانی بە بلال کرد دابەزە. قاویت وشیرم بۆ بکە هەتا ڕۆژوو بشکێنم. بلال گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ڕۆژماوە (لای وابوو ڕۆناکی ڕۆژیش وەکوو ڕۆژ مانعە بۆ إفطار) دووبارە فەرمووی (اجدح لي). یەعنی قاویت وشیرم بۆ بکە گوتی ڕۆژهێشتا ماوە واتە ڕۆناکی ماوە دیسان فەرمووی قاویتو شیرم بۆ بکە هەتا سێ جار بلال دابەزی شەربەتی قاویت وشیری بۆ کرد خواردیەوە پاشان بەدەست إشارەی بۆلای ڕۆژ هەلات کرد فەرمووی وەکوو دیتتان شەو لەلایی - ڕۆژهەلاتەوە هات وەقتی إفطار داخل دەبی (ش) لەم حەدیثە پیرۆزە زاندرا کەسێك لەڕەمەزان لەسەفەر دابی بەڕۆژووبیی باشترە چونکی پێغەمبەر (د) لەمانگی ڕەمەزان لە سەفەر دابووە وبە ڕۆژووش بووە لەبەر ئایەتی پیرۆزیش (وان تصوموا خَيرٌ لكم إنْ كنتم تعلمون) وەلەبەر بەرائەتی ئەمەو پیرۆزی کاتیش لە تەئریخی (١٣٣١) هەزارو سێ صەد وسی ویکی کۆچی (هجری عەرەبی) ئەك ڕۆمی لەرەمەزان تووشی سەفەرێك هاتم لەنیوە ڕۆی تەمووز بەچەند کەسانێکی ـر کە ڕەفیقی ڕێگام بوون گەیشتین بە دێرێکی دیانان قەشەو ڕەهبانی ...ی تیابوو لەژن و پیاوانیان. سەرۆکە کەیان پێ ی گوتم وادیارە تۆ بە ڕۆژووی بە دەلیلی( وَإن كنتم مرضى أو عَلى سَفَرٍ فعِدَّةٌ من أيامٍ أخر). بۆت هەبوو بەڕۆژوو نەبی. خودا وەلامی خستە ناو دلم و سەرزمانم گوتم بە دەلیلی ( وأن تصوموا خَيْرٌ لكم) بۆم هەبوو بەڕۆژوو ببم. وەلامەکەمی زۆر پێ خۆش بوو. فکرم وابوو پاش نوێژی عەسر بڕۆم، گوتی بەقەطعی نایەلم بڕۆی تا لێرە إفطار نەکەیەوە. بۆ إفطار ماست و دۆی ساردو چەند خواردنێکی خۆشی ڕێز کرد گوتی ئنجا ئەگەر دەڕۆن خودا یارو یاوەرتان بی.

٥٢٦ عن عائشةَ (ض) أن شِئتَ فَصُم وإن شِئتَ فأفطر.

## تەرجەمە

٥٢٦ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشەی دایکی ئیمانداران - ڕەزای خودای لێ

بی ـ گوتی حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی بە پێغەمبەری گوت. ئەرێ من لەسەفەر ڕۆژووی فەرز بگرم. چونکی لە ڕۆژوان زۆر ئازابوو پێغەمبەر (د) وەلامی داوە ئەمە ئاسان کردنێکە لە لایەن خودا ئەگەر حەزت کرد بە ڕۆژووبە ئەگەر حەزیشت کرد بشکێنە.

٥٢٧ عَن جابِرِ(ض) مامذا. ليس مِّنَ البِرُّ الصَّوْمُ في السَّفَرِ.

## تەرجەمە

٥٢٧ دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبد اللهی ئەنصاری ـ ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر لە سەفەرێك بوو چاوی بە قەلەبالغێكو كۆبوونەوەكی گەورە كەوت. پیاوێكیش سێبەریان لەسەر كردبوو. فەرمووی ئەمە چی یە گوتیان ئەمە قەیسی ئەبو اسرائیل عامریە بە ڕۆژوە لەبەر تێنو بوونی سێبەریان لەسەر كردووە فەرمووی بەڕۆژو وەكوو گەیشتە ئەم حالەتە سێبەری لەسەر بكرێ لە خواپەرستی وچاكەنی یە ڕۆژووگرتن لەسەفەر بەلام ئەگەر نەگاتە ئەم حالەتە لە خواپەرستی وچاكەیە. كەواتە ئەمە سوكی هەندێ ظاهریە بەم حەدیثە كە ڕۆژوو لەسەفەر دروست نی یە وە ئەما ڕیوایەتی ـ لَيسَ مِنْ أمبِرا مصيام في أم سفر ـ بە گۆڕینی لام بەمیم لە لوغەتی ئەهلی یەمەن ئەمە لەبو خاری نی یە لەمەسنەدی ئیمامی ئەحمەد هەیە. بەلام لە شێوەی زمانی قورەیشی دەلێن ( لَيسَ مِنَ البِرِّ الصيامُ في السَّفَرِ)

٥٢٨ عَن عائشةَ. مَن ماتَ وعليه صيامٌ صامَ عنه وليّه.

## تەرجەمە

٥٢٨ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ پێغەمبەر(د) فەرمووی هەر كەسێك مرد ڕۆژووشی لە سەربوو دروستە میزات گری بۆی بكرێتەوە.
(ش) بامردووەكە ئیزنیشی نەدابی یاخەلكی دیكە بۆی بكرێتەوە بەلام مردوەكە ئیزنی دابێ یاخزمی مردوەكە ئیزنی دابی ئەمە مەذهەبی قەدیمی شافعی یە ئەو قسە پەسندە لای قەولی تازەنی فدیە واجبە لەجیاتی هەر ڕۆژێك مستێك لە خواردن. ئەوەوی كوتیتی بۆ قەولی تازەی هیچ بەلكەیەك نی یە ئەو حەدیثە نەبێ دەرحەق بە خواردن بەخشین

ھەلتووە ئەویش زەعیفە ئەوەی لە حەدیث ھیارە مەبەست لە (ولیّ) وەلایەتی مالە کەمیرات گرە بەلام راجح وپەسند لای فیرقەی شافعی - غزمایەتی یە. چونکی پێغەمبەر (د) فەرمانی کردە ژنێك کە لەجیاتی دایکی بەرۆژوو بێ کە دایکیشیەنە - ولی - مالە نە - عەصەبەیە - لای ئیمامی مالکیش واجب فدیەیە واتە دەبی فدیە بدا. وەلامی ئەم حەدیثە شیان بەم تەرزە داوەتەوە کە کارکردنی خەلکی مەدینە بە پێچەوانەی ئەم حەدیثەیە. لای ئەبوو حەنیفەش وجوبی فدیەیە واتە دەبێ فدیە بدا. ئەویش وەلامی ئەم حەدیثەی داواوەتەوە گوتیتی حەزرەتی عائشە و ابن عباس لەسەر خلافی ئەم حەدیثە فەتوایان داوە. شرقاوی ص١٥٦ ج٢.

یەعنی ئەو حەدیثانەی لە خۆیان دەگێڕنەوە کە رۆژوودەبێ بگیریتە وەنەك فدیەی لەباتی بدەی دەبێ نەسخ کرابن واتە حوکمیان بەتالّ کراوە چونکی فتوایان پێچەوانەی ئەوانە.

٥٢٩ عَنْ ابن عباس (ض) نَعَم فدَيْنُ اللهِّ أحقٌّ أن يُقضى.

## تەرجەمە

٥٢٩ دەگێڕنەوە لە - کوری عەباس - رەزای خودای لێ بی - گوتی پیاوێك ماتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا دایکم مردووە رۆژووی مانگێکی لەسەرە ئایا بۆی قەضا بکەمەوە فەرمووی - بەلێ - بۆی قەضا بکەوە چونکی جوانترە بۆ بەندە بەجێ گەیاندنیَ حەقی خودا لە دانەوەی مالی خەلکانی تر.

٥٣٠ عَن سَهْلٍ ابنْ سَعْدٍ(ض) لايزال الناسُ بخَيْرٍ ما عَجّلوا الفِطرَ.

## تەرجەمە

٥٣٠ دەگێڕنەوە لەسەھلی کوری سەعدی ساعدی رەزای خودای لێ بی - پێغەمبەر (د) فەرمووی ھەموو کات خەلکی لە چاکە جودا نابنەوەھەتا حالیان وابی زوو رۆژوویان بشکێنن -

(ش) یەعنی وەکوو بەچاو دیتی یان خۆر ئاوابوو بشکێنن چونکی ١ نەریتی جوولەکەیە رۆژوو شکاندن دوادە خەن ھەتا ئەستێرە دەبینن.

٥٣١ عَن الرُّبَيّع بنت مُعَوّذٍ (ض) مَن أصبحَ مُفطِراً فليُتِمّ بَقِيّةَ يَوْمِهِ

وَمَنْ اصبَحَ صائماً فَليَصُمْ.

### تەرجەمە

٥٣١ دەگێڕنەوە لەروبەیعی کچی مەعویذی ئەنصاری لەوانە ـ کەلە ژێر دار پەیمانیان بە پێغەمبەر دابوو ـ (الذین بایعوا نبیّنا تحت الشجره).
گوتی پێغەمبەر (د) سبەینەی ڕۆژی عاشورا ناردیە دێهاتەکانی ئەنصار لەدەرەوەی‌مەدینە پێ یان بگوترێ هەر کەسێك ئەگەر شتێکی ئیمرۆ خواردووە. بامیچی تر نەخوا تا ئێوارە واز لە خواردن و خواردنەوە بێنی (إمساك بکا). وە هەر کەسێکیش هیچی نە خوارد با بە ڕۆژووبێ (روبەیع گوتی ئێمە خۆمان عاشورا بە ڕۆژوو دەبووین. وە ڕۆژومان بە منالە بچوکەکان دەگرت. لەخوری ڕەنگاو ڕەنگ شتێکمان بۆ دەکردن گاڵتەی لەگەلدا بکەن پێ یەوە بفافلێن. ئەوەك بگرییێن بۆ خواردن هەتا ئێوارە کاتی ڕۆژوو شکاندن.

٥٣٢ عَن أبي سعيد (ض) لاتواصلوا. فانّكمْ إذا أرادَ أن يواصِلَ فليُواصِل حتّى اُلسَّحَرِ قالوا فانّكَ تواصِلُ يارسول اللّه قالَ إنّي لستُ كهيئتِكُمْ.

### تەرجەمە

٥٣٢ دەگێڕنەوە لە ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی (وەصل) مەکەن ڕۆژوێك بە ڕۆژوێك بەم تەرزە دوو ڕۆژ لەسەر یەکتری بەڕۆژووبن پاشان ئەگەر حەزتان کرد وصال بکەن هەتا پاش شیو ویصال بکەن مەعنا وانەکەن شەوێك و ڕۆژێك هیچ نەخۆن. بەلکی یەکجار بۆ خۆتان هەربخۆن پێ یان گوت بەڕاستی تۆ (ویصال) دەکەی ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی من وەکوو ئێوە نیم.

٥٣٣ عَن أبي هريرَةَ (ض) وَايّكم مثلي إنيّ أبيتُ يطعمُني رَبّي ويسقيني لو تأخّرَ لزدتُكُمْ كا لتّنكيل لهمْ.

### تەرجەمە

٥٣٣ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی پێغەمبەر (د) نەهی کرد لە وصالی‌ڕۆژوو پیاوەکیش عەرزی کرد بەڕاستی تۆ ـ

وصالی دەکەی ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی کامەتان وەکوومنن بەڕاستی من دەمینێمەوە بەشەو خودا خواردن و خواردنەوەم پێ دەدا (واتە خودا هێزی ئەو بە ڕۆژوانەم دەداتێ کە بەشەو دەخۆن و دەخۆنەوە) پاشان وەکوو ئەصحابە بەرێزەکان وازیان لە ویصال نەمینا چونکی لایان وابوو نەهیەکەی پێغەمبەر بۆ ئامۆژگاریە مەبەستی حەرام کردن نی یە. ویصالی پێ کردن ڕۆژێك پاشان ڕۆژێکی تریش خولاصە دوو ڕۆژ بۆ خاتری مەصلەحەتێك هەتا حیکمەتە کەیان لێ ئاشکرا بی پاشان چاویان بە مانگی یەك شەوە کەوت. فەرمووی ئەگەر مانگ نەدیترا بایە زیاترم وصال پێ دەکردن هەتا خۆتان عاجز دەبوون وەتکای سووك کردنتان دەکرد وەکوو زەجر بۆ ئەوان.

(ش) حەقیقەتی ویصال ئەمەیە دوو ڕۆژ یازیاتر لەسەر یەکتری بەڕۆژووبی بەشەو عەمدەن بەبێ عوزر هیچ نەخوا ونە خواتەوە بە نزیك بوونەوە لە ئافرەتی خۆی وئاو خواردنەوە لە ویصال دەرناچی لە شەرحی موهەذەب وا دەلێ بەلام رویانی گوتیتی لەبەحر حەقیقەتی ویصال ئەمەیە دەوام بکا دوو ڕۆژ یا زیاتر لە هەموو ئەوەی ڕۆژووی پێ دەشکێ. قسەی راجح (بە پەسند زاندراو) ئەمەیە.

٥٣٤ عَن أبي جُحَيْفَةَ (ض) صَدَق سلمانُ. يعني في قولِهِ لابي الدرداء إن لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حقاً.

### تەرجەمە

٥٣٤ دەگێڕنەوە لە ئەبو جوحەیفەی وەبی کوڕی عبد الله - ڕەزای خودای لێ بی - پێغەمبەر (د) وەکو برایەتی دانا لەبەینی سەلمانی فارسی وئەبو الدرداء ڕەزای خودایان لێ بی سەلمان بە زیارەت چووەلای ئەبو الدرداء دیتی خێزانی گەورەی ابو الدرداء کە خەیرەی کچی ئەبو حەدحەدی ئەسلەمیە بوو لە جلکێکی کۆن وشڕدایە سەلمان فەرمووی ئەی دایکی دەرداء بۆچ واشڕی گوتی ابو الدرداى برات هیچ پێویستی بەدونیا نەماوە پاشان ئەبو الدرداء هاتەوە خواردنی بۆ سەلمان دروست کرد داوای لە ئەبو الدرداء کرد خواردنی لەگەل بخوا گوتی من بە ڕۆژوومە پاشان سەلمان گوتی من خواردنی تۆ ناخۆم تا لەگەل من نەخۆی ناچار لەگەل سەلمان خواردی, پاشان وەکوو شەو داهات ابو الدرداء هەستا نوێژ بکا ئەو شەوە هەینی (جومعە) بوو عادەتیشی وابوو شەوی جومعە نەدەنووست هەر نوێژی دەکرد بە ڕۆژیش بە ڕۆژوو دەبوو. سەلمان

فەرمانی پێ کرد هەستە بنوو لەبەر قسەی سەلمان خەوت نەختێکی پێ چوو ئیسان هەلستا ویستی بچی نوێژ بکا سەلمان فەرمانی پێ کرد بخەوە هەتا شەو تەواو دەبی. کەشەو تەواو بوو سەلمان بێ ی گوت ئیستا هەلستە هەردویان دەستی یان کرد بەنوێژ کردن پاشان سەلمان بە ابو الدردای گوت بەراستی بۆخودا لەسەر تۆ هەیە حەقێك بۆ نەفسی خۆت لەسەر تۆ هەیە حەقێك بۆ ئەهل وعائلەت لەسەر تۆ هەیە حەقێك ئنجا لازمە هەر خاوەن مافێك مافی خۆی پێ بدەی. ابو الدرداء هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) قسەکەی سەلمانی بۆ گێڕاوە فەرمووی سەلمان ڕاست دەکا قسەی ئەوە

(ش) لەم حەدیثە زاندرا ڕۆژووی سونەت واجب نیە تەواو کردنی. لای شافعی ئەگەر بە عوذر شکاندی وەکوو لەبەر مێوانی خۆشە ویست خێری ڕۆژوەکەشی دەگاتێ ئەمە مەذهەبی شافعی یەو ئیمامی أحمدی کوری حەنبل وجمهور ئەوانیش لەسەر ئەم قسەنە. لای ئیمامی مالك واجبە گرتنەوە وقەضای ڕۆژی سونەت ئەگەر بە قەصدەکی حەرام بشکێنی.

ئەو کەسی بە لەفکر چوون بشکێنی یا بە عوذرێکی وەکوو نەخۆشی بشکێنی قەضای لەسەر نی یە کەسێکیش وەکوو شروعی بە ڕۆژوی (نەفل) کرد واجبە تەواوی بکا حەرامە بیشکێنی بەبێ عوذر. ئەگەر کەسێك سێ بەسێ طەلاقی لێ خوارد دەبێ ڕۆژووت بشکێنی پیاوەکە طەلاقی دەکەوێ و ڕۆژووی خۆی ناشکێنی ئەگەر شکاندی قەضای لەسەر واجبە تەنیا باوکو پیاوی أختیار نەبێ باسوێندیشی لێ نەخۆن لەبەر ڕێز گرتنی ئەوان ئەگەر بیشی شکێنی قەیناکە هیچی لەسەر نی یە.

لای ئیمامی حەنەفی پێویستە گرتنەوەی ڕۆژوو، شکانی ڕۆژوەکەی چی بە قەصد بێ یابێ قەصدی بێ. وەکوو کەوتنە حەیزی ژنێکی کە بە ڕۆژووبێ بە ڕۆژووی (سونەت). بەلام شکاندنی ڕۆژووی سونەت حەلال نی یە بە عوذر نەبێ. لای هەندێکیانیش حەلالە بەبێ عوذر. ئایا مێوانداری ـ عوذرە ـ دەبێتە هۆی ڕۆژوو شکاندن؟ ـ یان نا: لێرەشدا ڕای جیا جیا هەیە. بەلگەشیان لە دروست نەبوونی شکاندن ئەم ئایەتەیە (ولا تبطلوا أعمالكم) وەلامیان دراوەتەوە واتە طاعەتان مەفەوتێنن بە گوناحی گەورەو بەکفر وبە دوو ڕوویی وبە لەخۆبایی بوون وبە ڕیا وغەیری ئەمانەش.

إبن المنير گوتیتی بۆ حەرام کردنی تەواو نەکردنی ڕۆژووی سونەت بەبێ عوذر هیچ بەلگەیەك نی یە بەلگەی گشتی نەبێ وەکوو ئایەتی پیرۆز ((ولا تبطلوا أعمالكم)) بەلام بەلگەی تایبەتی باحەیشیش بێ

وەکوو حەدیسی [((الصائمُ المتطوعُ أمير نفسه ان شاء صام وان شاء افطَرَ)). پێشەکی لەسەر بەڵگەی گشتی با ئایەتیش بێ. نووسەری ئەم دێرانەش دەڵێ قسەی (ابن المنير) چاکترینی قسەکانی ڕابردووە چونکی ئەوەی ڕۆژووی سونەت دەگرێ بەخۆی فەرمان ڕەوای خۆی بێ ویست وئارەزوو لە دەست خۆی بێ لە ڕۆژوو تەواو کردن و تەواو نەکردن بۆچی دەبێ قەضا بکاتەوە - واتە پێیگیرێتەوە - هەر وەکوو مالکی وحەنەفیەکان وایان حوکم کردووە. ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ.

٥٣٥ عَنِ عائشةُ (ض) خُذوا مِن العَمَلِ ماتطيقونُ فأنَّ اللهَ لايَمَلُّ حتىَّ تُملوُّا

## تەرجەمە

٥٣٥ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە - ڕەزای خودایان لێ بی - گوتی پێغەمبەر (د) دەی فەرموو بگرن لە کاری باش ئەوەندەی کە دەتوانن بە دەوام لەسەری بن بە هەوەسەوە. چونکی خودای گەورە ڕەفتاری ئەو کەسانەتان لەگەل ناکا کەکزو بێ تاقەتن لەسەر خواپەرستی هەتا ئێوە کزوبێ تاقەت دەبن - وەکوو کزو بێ تاقەتیش بوون بێ پاداشت دەبن.

٥٣٦ عَن عبد الله ابن عمرو (ض) فَصُمْ صيامَ داودَ عليه السلام. قال وكيف. قال كان يصوم يوماً ويُفطِرُ يوماً ولايفرُّ اذا لاقى لاصامَ من صامَ الابد.

## تەرجەمە

٥٣٦ دەگێڕنەوە لە عبدوالڵای عەمری کوڕی عاص - ڕەزای خودایان لێ بی - ئەم حەدیسەی عبد الله لە باسی - نوێژ - ڕەت بوو بەڵام ئەمە زیادە کەیەتی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بە ڕۆژووبە وەکوو ڕۆژووەکانی داوود - سەلامی خوای لێ بی - عبد الله گوتی داوود پێغەمبەر چۆن بەڕۆژوو دەبوو فەرمووی ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو ڕۆژێک پێ نەدەبوو ئنجا چونکی بەم جۆرە بە ڕۆژوو دەبوو بۆشەڕ لەگەل دوژمن بێ تاقەت نەدەبوو وەکوو لەگەل دوژمن بگەیشتبانە یەکتر هەڵ نەدەهات. بە ڕۆژوو نەبوو ئەو کەسەی تەواوی ساڵ بەڕۆژوو دەبێ.
(ش) لەم حەدیسە وازاندراوە کە دروست نی یە واتە مەکروهە یەکێک تەواوی ساڵ بەڕۆژووببێ بەلام وەلام دراوەتەوە ئەم حەدیسە دەرحەق بەو

کەسەیە کەبەبە ڕۆژوو بوونی هەموو تەواوی زەمانە زیان مەنفیبی. ئەگەر نا بە ڕۆژووبوونی زەمانە - صوم الدهر - سونەتە لەبەر حەدیثي - مَن صامَ الدهرَ ضيقت عليه جهنم - واتە ئەوەی زەمانە بە ڕۆژووبێ دووزەخی لێ وێك دێتەوە - دەستی خۆی گوشی هەتا وەك گرێ یەکی لێ هات. مەبەست لەمە ئەوەیە کە ئەوکەسەي زەمانە بە ڕۆژووبێ جێ ی لە جەهەنەم نی یە. بەلام بە ڕۆژووبوونی وەکوو داود باشترە لای زاناکان.

٥٣٧ عَن انس (ض) اعيدوا سَمْنَكُمْ في سِقائِهِ وتَمرَكُمْ في وِعائِهِ فانّي صائمٌ فقالت اُمُّ سُلَيْمٍ إنَّ لي خُوَيِّصَةً يارسول الله صلىَ الله تعالى عليه وسلم قال ماهي قالت خادمك انسٌ فما ترَكَ خيرَ آخِرَةٍ ولا دُنيا الاّ دَعالي بِهِ اللهمَّ ارزقه مالاً ووَلداً وبارِكْ له فيهِ فانّي لمِنْ اكثرِ الانصارِ مالاً.

تەرجەمە

٥٢٧ دەگێڕنەوە لەئەنەس - ڕەزای خوای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) چووەلای دایکی سولەیم دایکی ئەنەسی ناوبراو. ئەویش هەندێ خورماو هەندێ ڕۆنی هێنا کە چێشتی بۆ بکا ڕۆنەکەتان لە هیزە بکەوە. خورمایە کەشتان لە کیفکە کەی خۆی بکەوە چونکی من بە ڕۆژووم. پاشان دایکی سولەیم - عەرزی کرد من خدمە تکارەکی مەخصوص بە خدمەتی رسالەت پە ناهتانم هەیە فەرمووی کێ یە گوتی خدمە تکارت ئەنەس دوعایەکی تایبەتی بۆبکە ئنجا لە نەفعی قیامەت و دونیا هیچی نە هێشتەوە دوعای هەمووی بۆ کرد یەك لە دوعایەکانی ئەمە بوو فەرمووی ئەی خودایا ماڵ ومندالی پێ بدە بەرەکەت و زێدەکی بخەرە ناو ماڵ ومندالی. ئنجا ئەنەس گوتی من بووم بە دەولەمەند ترینی ئەنصار (خوَیِّصه مصغّري خاصه یە)

٥٣٨ عَن عِمرانَ (ض) يا ابا فُلانٍ اما صُمْتَ سَرَرَ هذا الشهرِ قال الرَّجُلُ لا يارسول الله قالَ فاذا أفطرْتَ فصُمْ يَومَيْنِ

تەرجەمە

٥٢٨ دەگێڕنەوە لە عمرانی کوڕی حەصین (لە سالی خەیبەر موسولمان بو

مێژووی پەنجاو شەش کۆچی دوایی کرد ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (٥٣٨ ـ) پیاوێك لە یارانی خۆی گوت ئەی باوکی فلان تۆ بەڕۆژوو نەبووی لە دوای ئەم مانگی شەعبانە.چونکی پیاوەکە عادەتی بوو آخری هەموو مانگان کەبیست وهەشت وبیست ونۆ وسی. بە ڕۆژوو دەبوو کە (أیام السوریان) پێ دەگوت بۆیە بە حەدیثی ڕابردوو ـ لاتقدموا رمضان بیوم أو یومین هیچ اشكال وارد نابێ) پیاوەکە گوتی نا ئەی پێغەمبەری خودا پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو لە ڕەمەزان خەلاص بووی پاش جێژنە دوو ڕۆژ بە ڕۆژووبە لە جیاتی آخری شەعبان

٥٣٩ عَن جُوَيْرِيَّةَ (ض) أَصُمتِ أمسِ قالت لا قالَ تريدينَ ان تصومي غداً قالت لا. قالَ فأفطري.

## تەرجەمە

٥٣٩ دەگێڕنەوە لە دایکی ئیمانداران جویریی کچی حەرثی موصطەلقیە. بێ لەم حەدیثە لەبو خاری لە روایەتی ئەو هیچ حەدیثی تر نی یە. پێغەمبەر (د) لە ڕۆژی جومعە تەشریفی کردە لای ئەویش بە ڕۆژوو بوو فەرمووی ئەرێ تۆ بەڕۆژوو بووی دوێنێ: گوتی: نا گوتی فکرت وایە سبەی بە ڕۆژووبی ـ گوتی نا فەرمووی کەوایە ڕۆژوەکەت بشکێنە.

(ش) لای ئیمامی شافعی هەروەکوو مەکروهە بە تەنیا ڕۆژی جومعە بە ڕۆژووبی. پەسند نی یە شەموو یەکشەمیش تەنیا تەنیا بە ڕۆژوو ببی ـ چونکە تەشبیەو وێ چوونەکی تێدایە لەگەل جوولەکە ودیان. بەلام دووشەم و پێنج شەم سونەتی بەخێرە لای ئیمامی ئەعظەمیش ناپەسند ومکروە نی یە تەنیا ڕۆژی جومعە بە ڕۆژووبی بەلكی (خلاف الاولی) یە: واتە جومعە بە ڕۆژوو نەبی باشترە.

٥٤٠ عَن ابنِ عباس (ض) ماهذا فأنا أحَقُّ بموسى منكم قالهُ يَوْمَ قَدِمَ المدينةَ فرأى اليهود تصوم يوم عاشوراء.

## تەرجەمە

٥٤٠ دەگێڕنەوە لە کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) وەکو تەشریفی کردە مەدینە دیتی جوولەکە ڕۆژی عاشورا بە ڕۆژوو دەبن پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەمڕۆژووە چی یە؟. ئەی جوولەکەینە گوتیان ڕۆژێکی باش وپیرۆزە. ڕۆژێکە خودا بەنی اسرائیلی نەجاتدا لە

دوژمن ئنجا حەزرەتی موسا لەم رۆژە دا بە رۆژوو بوو پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێوەش ئەی موسولمانان بە رۆژوبن.
لەمەدا دەلیل هەیە بۆ ئەو کەسەی گوتویەتی رۆژووی عاشورا واجب بووە لە پێش نەسخ بەلآم عولەمای شافعی وەلامیان داوەتەوە پێغەمبەر مەبەستی فەرمان کردن بە رۆژوو نەبوو بەلکو پێ ی خۆش بووە لەم رۆژە خەلك بە رۆژووبێ: نەك کردنی بەواجب. لای ئیمامی شافعی سێ رۆژ بە رۆژووبوون سونەتە لە عاشورا (مەبەستی لێرەدا عاشورا رۆژی عەرەفەی جەژنی قوربانە - نەك عاشورای - کە خەلکی بەدە رۆژی یەکەمی مانگی موحەرەمی تێبگەن.
حەدیثی امامی أحمدیش وادەلالەت دەکا کە پێغەمبەر فەرموویەتی ( صوموا یومَ عاشوراء وخالفوا الیهودَ وصوموا قبله یوماً وبعده یوماً )
وەسونەتە رۆژووی عەرەفە یەعنی رۆژی نۆی ذي الحجه - چونکی سوءال کرا لە پێغەمبەر (د) فەرمووی رۆژووی عەرەفە تەکفیری گوناهی سالی رابردو سالی داهاتوو دەکا روایەتی - موسلمە - واتە گوناهی سالی پێشوو سالی پاشوو دەسرێتەوە. بەلام شەش رۆژ بە رۆژوو بوون لە مانگی شەوال سونەتە لەبەر حەدیثی موسلم - فەرموویەتی پاداشتی رۆژووی تەواوی سالی هەیە. چاکتریش وایە لەگەل رمضان بی - امامی مالك گوتیتی مەکروهەو پەسندنی یە نەوەك نەزانەکان بیکەنە تەواوکەری رەمەزان. حەنبەلیە کانیش دەلێن بەرۆژوو بوونی مانگی رەجەب پەسندنی یە. بەلام کەراهەتی دەشکێ بە شکاندنی یەك رۆژ. واتە ئەگەر لەمانگی رەجەب یەك رۆژێ نەبی ئەویتر هەمووی پێ بی دروستە. بەلام دروست نی یە ئەگەر مانکی رەجەب هەمووی پێبی.

## باب فضائل لیلة القدر
## باسی گەورەیی شەوی قەدر

٥٤١ عَن ابنِ عمر (ض) أری رُؤیاکم قد تواطأت في السبع الاواخر فمن کانَ متحرّیها فلیَتحرَّها في السبع الاواخر.

### تەرجەمە

٥٤١ دەگێرنەوە لە کوری عومەر - رەزای خودای لێ بی چەند پیاوێك لە ئەصحابی پێغەمبەر (د) لەخەو خەبەریان پێ درا. کە لیلة القدر - لە حەوتی آخری رەمەزانە پێغەمبەر (د) فەرمووی دەبینم خەونی هەمووتان

ڕێك كەوت لە حەوت ڕۆژی دوایی ڕۆژەكانی مانگی ڕەمەزان. ئنجا هەر كەسێك لیلة القدری دەوێ با داوای بكا لە حەوت ڕۆژی دوایی مانگی ڕەمەزان بەبێ دیار كردنی ڕۆژەكە. (ئەوەی دیارە مەبەس لەحەوت ڕۆژی دوایی دە ڕۆژەكەی دوایی مانگی ڕەمەزان ئەو وەختە بیست ویەك و بیست وسێ بەبەر ناكەوی لە تاقەكان ـ بەلام شەرقاوی دەلێ مەبەست پاش ببست بێ باشترە ئەو وەختەش شەوی بیست ونۆ بەبەر ناكەوێ بەلام لەسەر احتمالی ئەوەل واتە ڕای یەكەم بەبەر دەكەوێ.

٥٤٢ عَنْ ابي سعيد (ض) إنّي رأيت ليلة القدر ثم أُنسيتُها أو نُسّيتُها فالتمسوها في العشر الاواخِرِ في الوَترِ وإنيّ رأيت انّي أسجُدُ في ماءٍ وطينٍ فَمَن كانَ اعتَكَفَ مع رسوْل الله صلى الله تعالى عليه وسلم فليَرجِعْ.

## تەرجەمە

٥٤٢ دەگێڕنەوە لە ئەبو سەعیدی خودری ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی ئێمە إعتكافمان كرد واتە لە مزگەوت ماینەوە ـ لەگەل پێغەمبەر (د) لە دەی ناوەندی ڕەمەزان هاتە دەرێ ـ پاشان دوانەكەی بۆ ئێمە خوێندەوە فەرمووی من نیشانم درا لیلة القدر. پاشان بەیەكجار لەبیرم بردرا ـ ئەم جیاوازی قسەیە لەو كەسەیە كە گێڕایتی یەوە ـ ئنجا داوای بكەن لەدەشەوەی دوایی ڕەمەزان لە تاقەكانی وە بەڕاستی دیتیشم من سوجدەم دەبرد لەناو ئاوو قوڕ. ئنجا هەركەسی لە أعتكاف دابووە ـ لەگەل پێغەمبەری خودا بابگەڕێتەوە جێگای اعتكافی خۆی ئەبو سەعید گوتی ئێمە گەڕاینەوە جێگای خۆمان هیچ هەورێك لە ئاسمان نەبوو دیتمان هەور پەیدا بوو دای ڕژاندە باران لە سەربانی مزگەوت ئاو هەلڕژا. نوێژی سبەینەیش دابەسترا چاووم لێ بوو پێغەمبەر (د) سەجدەی لەناو ئاوو قوڕ دەبرد هەتا دیتم شوێنە واری قوڕەكە لەناو چەوانی بیرۆزی دیار بوو واتە ناوچەوانی بەقوڕ ببوو.

٥٤٣ عَنْ ابنِ عباس (ض) التمسوها في العشر الاواخِرِ من رمضان ليلةَ القدرِ. في تاسِعَةٍ تبقى في سابِعَةٍ تبقى في خامِسَةٍ تبقى

## تەرجەمە

٥٤٣ دەگێڕنەوە لە عبد اللەی کوڕی عباس ( ڕەزای خودای لێ بی)، پێغەمبەر (د) فەرمووی داوای تەصادفی شەوی قەدر بکەن لەدە ڕۆژی دوایی مانگی ڕەمەزان نۆ شەوی دەمینێ. لە بیستو سێ کە ڕەمەزان حەوت شەوی دەمینێ. لەشەوی بیست وپێنج کە ڕەمەزان پێنج ڕۆژ دەمینێ تەواو ببی.

(ش) ئەم عبارەتە شیرینەی فەخری عالەم لەم حەدیثە پیرۆزە لەسەر ڕەوشتی عەرەبە لە مێژوو (تەئریخ) چونکی عادەتیان وابوو وەکو مانگ لەنیوە ڕەت ببێ بە ڕۆژەکانی دەمینێ لە مانگ تەئریخ دادەنێن نەک بەڕۆژەکانی ڕابردوو مەسەلەن بیستو یەکی مانگ بێ ئەگەر بپرسی چەندی مانگە دەلێن نۆ ڕۆژ ماوە نالێن بیستو یەکی مانگە هەر بەم وێنە.

٥٤٤ عَنْ ابنِ عباس ايضاً في روايةٍ (ض) هي في العشرِ الاواخِرِ في تِسْعٍ يَمضِينَ أو في سَبْعٍ يبقِينَ يعنى ليلة القِدْرِ.

## تەرجەمە

٥٤٤ دەگێڕنەوە لە کوڕی عەباس - ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی لیلة القدر نۆیە مینی دەی ئاخری ڕەمەزانە لە ڕۆژانی ڕابردوو. کەدەکا بیستو نۆیەم یاخۆ شەوی بیست وسێ یەم هەوە کە حەوت ڕۆژ ماوە ڕەمەزان تەواوبی.

# باب الاعتكاف في المساجد
# باسی مانەوە لەمزگەوتان
# (( خەلوەکێشان ))

٥٤٥ عَن عُمَر (ض) فاوفِ بِنَذْرِكَ.

## تەرجەمە

٥٤٥ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی گوتی لە زەمانی جاهلیەت واتە پێش ئیسلام لەسەر خۆم نەذر کربوە کەشەوێک لە مسجد الحرام کەعبە اعتکاف بکەم. فەرمووی نەذری خۆت بەجێ بگەیەنە.

(ش) ئەمر لێرە بۆ ایجاب نەبووە چونکی ئەو کاتە کافر بووە. نەذری کافرانیش راست نی یە. لای حەنبەلیە کان - واتە مەذهەبی ئیمامی ئەحمەد - نەذری کافر ڕاستە. ئەو وەختە نەذر بۆ ایجابە. استدلال کراوە بەمە کە دروستە أعتکاف - مانەوە لە مزگەوت بۆ خواپەرستی - بەبێ ڕۆژوو. چونکی حەزرەتی عومەر فەرمووی شەوێك اعتکاف بکەم شەویش ڕۆژووی لێ ناگیرێ. بەلام مالکی وحەنەفیەکان ڕۆژوویان گێراوە بە مەرج بۆ أعتکاف ئەوەیان کردووتە بەلگە کە پێغەمبەر (د) أعتکافی نەکردووە بەبێ ڕۆژوو (یەعنی هەر لە ڕەمەزان أعتکافی کردووە) بەلام لەم بەلگەیان تێبینی - ملاحظە - هەیە چونکی وابوو کە لە شەوال أعتکافی کردووە.
هەر وەکوو لە حەدیثی عائشە لە پاش ئەم حەدیثە بەیان کراوە. پاشان أختلاف لەماوەی چەندی یەتی مانەوە لە مزگەوت هەیە.
لای ئیمامی شافعی لە پاش نی یەت بەقەدر گوتنی سێ سبحان الله دەوام بکا. لە مزگەوت أعتکاف ڕاستە. بەلام لای ئەبوو یوسف کەمترین ماوە بۆ أعتکاف یەك سەعاتە لای ئیمامی محمد نیو ڕۆژە. لای ئیمامی ئەعزەم شەوێك و ڕۆژێکە. بەلام تەواوی أعتکاف دە ڕۆژە. لەنی یەتی أعتکافیش بلێ نیەتم وایە بۆ ڕەزای خودای لەم مزگەوتە ئەمەندە سەعاتە یا ئەمەندە ڕۆژە بە أعتکاف دەوام بکەم ئنجا هەر بەدڵ یا خۆ بە زمانیش بلێ باشە.
پاشان بۆدەست نوێژ بۆ غوسل بۆدەست بە ناو گەیاندن بۆ کارێکی وانەبێ نابێ لە مزگەوت بێتە دەرەوە نابێ لەگەل خێزانیشیدا جووت بێ ئەگەر نا أعتکافەکەی تێك دەچێ. هەر وەکو گوناهێکی کردبێ وایە. خواردن وخواردنەوەی پێش زەمانی أعتکافی بۆ دروستە کەبخوا وبخواتەوە ڕابواردنی ماوەی کە لەناو مزگەوتە بە قورئان خوێندن و سونەت کردن وصەلەوات لێدان بباتە سەری باشترە.

٥٤٦ عَنْ عائِشَةَ (ض) ماهذا البِرَّ تقولون أي تظنون عنى لغة سليم.

## تەرجەمە

٥٤٦ دەگێرنەوە لە حەزرەتی عائشە - ڕەزای خودای لێ بی - پێغەمبەر(د) ئیرادەی فەرموو وەکوو چوو بۆ ئەو جێگایەی کە فکری وابوو ئیعتکاف لەوێ بکا چاوی بەسێ خیوەت کەوت لە خوری نەك لەموو پرسیاری کرد ئەم خیوەتانەچین. گوتیان ئەمە ئی عائشە وحەفصە وزەینەبە هەرسێ ژنەکانی پاکی ئێوەن بۆ أقتدا بە حەزرەتی رسالت پەنەهتان لەمانەدا

ئیعتکاف دەکەن فەرمووی کردەوەی ئەوانە بە ئیشیکی باش دەزانن بە خوا پەرستنەکی ڕاست دادەنێن. ئنجا گەڕاوە لە جێگای ئیعتکاف. ئەو ئیعتکافی فکری وابوو لە دە ڕۆژی دوایی مانگی رەمەزان بکا دوای خست بۆدەی یەکەمی مانگی شەوال. بە گێڕانەوە هەتا ڕۆژی جەژنەشی بە أعتکاف رابوارد.

(ش) ڕابواردنی ڕۆژی جەژنی بە (أعتکاف) مەرج نی یە لێرەدا بە ڕۆژووبی بەلکوو نابێ بە ڕۆژووبی هەروەك أمامی شافعی وئیمامی ئەحمەد وادەلێن. بەلام ئیمامی حەنەفی ومالك دەلێن. ئەگەر چی لە شەوالیش لە أعتکاف دانیشتووە بەلام لەپاش ڕۆژی جەژنەوە دانیشتووە. بە ڕۆژوش بووە.

٥٤٧ عَن صَفيَّةَ (ض) على رِسْلِكُما اِنّما هِيَ صفيَّةُ بنتُ حُيَيّ إنَّ الشيطانَ يبلغ مِن الانسانِ مبلغَ الدَّمِ وَ اِنّي خشيتُ أن يقذِفَ في قلوبكما شيئاً.

## تەرجەمە

٥٤٧ دەگێڕنەوە لە دایکی ئیمانداران صەفیەی خێزانی پێغەمبەر (د) پێغەمبەر لەدە ڕۆژی دوایی مانگی رەمەزان لە مزگەوت لە أعتکافدا بۆشەوێك صەفیە بە زیارەت بۆ خدمەت پێغەمبەر هات زەمانێك بەیەکەوە قسەیاز کرد پاشان هەلستا بۆ مالی خۆی بگەڕێتەوە. لە روایەتی هشام مالیشی لە خانووی ئوسامە دابوو. پێغەمبەریش (د) لەگەلی هاتە دەرێ بیگەینتە جێگای خۆی لەڕێگا تووشی دوو پیاو هاتن لە ئەنصار ـ ئوسەیدی کوری حوفەیرو عبادی کوری بیشر پێغەمبەر (د) بانگی کردن فەرمووی پەلە مەکەن لەسەر خۆ بڕۆن ئەم ئافرەتەی کە لەگەلَ منە ئەمە صەفیەی کچی حی ئەخطەبە ـ حي سەرۆکی خەیبەر بوو). خێزانی خۆمە پیاوەکان گوتیان سبحان الله ئەی پیغەمبەری خودا خودا پاکە لەوەی پێغەمبەری ئەوَ شتێکی خراپی بدرێتە پالَ. ئەم قسەی پێغەمبەریان زۆر لەلا گەورە بوو. پێغەمبەر (د) فەرمووی شەیتان لە خصوص اتصالی بە انسان وجودا نەبوونەوی لە مرۆڤ لەگەل خوێن لەیەك مەرتەبەو پایە دانە.

(پێغەمبەر بۆیە ئەم قسەیەی کرد نەوەك ئەوان وابیر بکەنەوە نەخوازەلا ژنێکی بیگانەیە لەگەل پێغەمبەر بەم شەوە بە ڕێدادە ڕوا).

# بەشی دووەم لە زوبدەی بوخاری
# ( كتاب البيوع )
## باسی كڕین ومامڵەت

٥٤٨ عَن أبي هريرَةَ (ض) انَّهُ لن يَبسُط احَدٌ ثوبَهُ حتى اقضِيَ مقالتي هذه ثمَّ يجمَعُ إلَيهِ ثوبَهُ إلاّ وعى ما اقولُ

### تەرجەمە

٥٤٨ دگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خۆدای لێ بی) گوتی ئێوە بەمن دەلێن تۆ زۆر حەدیث روایەت دەکەی من وەکو مهاجرو ئەنصار لە بازارِ مەشغولی کڕین وفرۆشتن نە بوویمە. ئەو حەدیثە پیرۆزانەی کە ئەوان لەبیریان چووەتەوە. من لەفکرم نەکرد لەبەر ئەم حیکمەت وەۆیە. ڕۆژێك پێغەمبەر (د) وەعزی دەدا لە کاتی وەعز فەرمووی هیچ کەسێك ڕاناخا عەبای خۆی بۆ لەسەر دانیشتنی خۆی هەتالەم قسەی خۆم دەبمەوە پاشان وەکوو لەقسەی خۆم بوومەوە. وە عەبایەکەی خۆی گرد بکاتەوە یەعنی بیخاتە سەر خۆی وە قۆلی تێ هەل بکێشی. وە الامەگەر لەبەر دەکا هەرچی من دەلێم. ئەبو هورەیرە گوتی وەکو ئەم قسەم لە پێغەمبەر (د) بیست. بە ئازایی عەبایەکەی خۆم لەبەر خۆم داڕنی پانم کردەوە لەسەر عارد. لە پاشانیش خڕم کردەوە عەباکەم لەباوەشم کرد. لە پاش ئەو ڕۆژە هەر قسەیەکی لە پێغەمبەرم بیست (د) بە قەطعی لە بیرم نەچوو

٥٤٩ عَن عبد الرحمن ابن عوف. تزوَّجتُ. قال نَعَم قالَ وَمَن قال امرأةُ مِن الانصار قال كما سُقْتَ. قال زِنةَ نَواةٍ من ذَهَبٍ فقال أولِمْ. ولو بِشاةٍ.

### تەرجەمە

٥٤٩ دەگێڕنەوە لە عبد الرحمن ی کوڕی عەوف ـ ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو هاتینە مەدینە پێغەمبەر (د) برایەتی خستە بەینی من و سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری خەزرەجی نەقیبی بەدری ـ یەعنی ئێمەی کردە

برای یەکتری - وەکوو چووینە مەدینە لە پاش پێنج مانگ پێغەمبەر (د) ئەم برایەتی یەی دانا. میراتمان لەیەکتریمان دەگرت خزم میراتی نەدەگرت هەتا ئایەتی ( واولو الارحام بعضهم أولى بِبَعْضٍ) هاتە خوارێ. ئنجا سەعدی کوڕی رەبیع بە عبد الرحمانی گوت من بە ماڵ دەولەمەنترین ئەنصارم ماڵەکەم دابەش دەکەین لە بەینی هەر دوکمان تەماشاش بکە لەو دوو ئافرەتەی کەمەیتم کامەی حەز دەکەی طەلاقی دەدەم وەکو عیدەی تەواو بوو لەتۆی مارە دەکەم عبد الرحمان گوتی من پێویستی شتی وانیم بەلام هیچ بازاڕێك هەیە کڕین وفرۆشتنی تیا بکری. سەعد گوتی بازاڕی قەینقاع هەیە کە کۆمەلێکن لە جوولە کە. عبد الرحمان بۆ بازاڕەکە چوو هەندێ کەشك وڕۆنی هێنا لە پاشان دووبارە بۆ بازاڕ چۆوە زۆری پێ نەچوو هاتەوە خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی ژنت هێناوە گوتی بەلێ فەرمووی کێ یە گوتی ژنێکە لە ئەنصار( کچی أبو الحیرەی أنەس کوڕی رافعی ئەنصاری ئەوسی یە) فەرمووی بە چەندت هینا گوتی بەکێشی دانە قەسپێك زێڕ یەعنی پێنج درهەم زێڕ فەرمووی داوەت بکە بابە کوشتنەوەی یەك مەڕیش بێ.
(ش) داوەتی ژن گواستنەوە سونەتە وەکوو قوربانی لای هەندێکیش واجبە لەبەر ئەوەی فەرمانی کرد پێغەمبەر بە کردنی داوەت (وەلیمە).

٥٥٠ عَن النُّعمانِ ابنِ بشير. الحلالُ بيّنٌ والحرامُ بيّنٌ وَبينهما أمورٌ مشتَبِهَةٌ فَمَن تُرَكَ ما شُبِّهَ عَلَيْهِ مِن الاثم كانَ لِما استبانَ أتْرَكَ. وَمن اجترَءَ على ما يُشكُ فيهِ مِنَ الاثمِ أوشَكَ أن يُواقِعَ ما استبانَ. والمعاصي حِمَى اللّه مَن يرتَع حَولَ الحمى يوشِكُ ان يواقِعَهُ.

## تەرجەمە

٥٥٠ دەگێڕنەوە لە نەعمانی کوڕی بەشیر - ڕەزای خودای لێ بی - پیغەمبەر (د) فەرمووی حەلال ئاشکرایە حەرامیش ئاشکرایە ودیارە بەلام لەبەینی ئەوان هەندێ کاروباری بە شوبهە هەیە. ئنجا هەر کەسێك تەرك بکا ئەوشتی کە شوبهەی تیاهەیە گوناهبێ. بۆ ئەوشتی کەبە ئاشکرا گوناهبێ دەبێ چاکتر بەجێ بێلی ونەی کا هەرکەسێکیش - جەسارەت بکا بۆ ئەو شتی کە شوبهەی تیاهەیە نزیکە بکەویتە ناو ئەوشتی کە بە ئاشکرا گوناهە. هەموو گوناه وقەدەغە کراوێك پاوانی خودانە. هەرکەسێك حەیوان و مەڕو ماڵات بلەوە ڕێنی لە دەورەی پاوان نزیك دەبی بکەویتە ناو پاوانەکەیش.

٥٥١ عَنْ عائِشَةَ (ض) هُوَلَكَ يا عبدُ ابنَ زَمعَةَ الولدُ للفِراش ولِلعاهِرِ الحَجَرُ ثمّ قالَ لِسَودَةَ اِحتَجِبي مِنهُ.

## تەرجەمە

٥٥١ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە ـ ڕەزای خودای لێ بی. گوتی برایەکەی سەعدی ابن ابي وەقاص کەناوی عوتبە بوو کافر بوو وەکوو هاتە سەرمردن بە سەعدی برای خۆی گوت بەڕاستی کوڕی جاریەی موستەفرەشەی زەمعەی باوکی سەودەی دایکی ئیمانداران کوڕی منەو لە ئاوی زینای منە. تۆ بیهێنەوە لای خۆت ئنجا لە سالی گرتنی مەکە. سەعد کوڕەکەی گرت گوتی ئەمە برازای منە. برای من لەسەرە مەرگ ئەم وەصیەتەی خۆی بەمن ئەسپاردووە عەبدی کوڕی زەمعە هەلستا گوتی ئەمە برای منە لە جاریەی موستەفرەشەی باوکمە مرافعەیان کەوتە لای پێغەمبەر (د) سەعد گوتی ئەی پێغەمبەری خودا. برازای منە. برای من لەسەرە مەرگ وای بەمن گوت عەبدی کوڕی زەمعە گوتی برای منە لە جاریەی موستەفرەشەی باوکمە. لەسەر نوینی باوکم لە دایك بووە. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەم کوڕە بۆتۆیە (یەعنی برای تۆیە بە استحقاق ئەی عەبدی کوڕی زەمعە. پاشان فەرمووی منالٓ بۆ ئافرەتی مەوطوئەیە ، بۆزانیش بەرد هەیە. (واتە ئەو بەردەی کەپێ بکوژرێ و ڕەجم بکرێ. یاخۆ قسەیەکە بۆ پیاوی بێ بەش هەروەکوو لەکوردیشدا دەگوترێ فلان هەر بەردی دەست کەوت بەسەرکی خۆی دابدا) پاشان پێغەمبەر فەرمانی بەسەودەی کچی زەمعە کەدایکی ئیمانداران وخێزانی پێغەمبەر بوو. پاش خۆت بشێرەوە لەم کوڕی کێشەی لەسەر هەیە کەناوی عبد الرحمن بوو ـ چونکی شکەکی لێ پەیدا بوو لە کوڕەکە لەگەل عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاص. ئنجا هیچی تر کوڕەکە چاوی بە سەودە نەکەوتەوە. هەتا مرد.

(ش) شەرعەن کەسێك ئینکاری ئەولادی خۆی نەکا. لعانیش (١) لەبەینی

---

(١) لعان ئەوەیە ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی لە حالی زینا دیت لەگەل یەکێکی تردا . ژنەکەش انکاری کرد پیاوەکە لای قازی چوار جار دەلێ شاهیدی دەدەم بەخودا من لەراست گۆیانم لەم قسەی دەیکەم جاری پێنجەم دەلێ لەعنەتی خوا لەمن بێ ئەگەر درۆ بکەم ژنەکەش چوار جار دەلێ شاهیدی دەدەم بەخودا مێردەکەم درۆ دەکا جاری پێنجەم دەلێ غەزەب ولە عنەتی خوا لەمن بێ ئەگەر ئەو ڕاست بکا .

بەم شێوە لەیەك جیا دەبنەوە ومارەی و نەفقە لێرە دا بۆژنەکە نی یە . وەجارێکی تریش گەڕانەوە نی یە بۆ ژنەکە بۆلای مێردەکەی ص١٧٢ قانون الاحوال الشخصیە للدکاترە : احمد علی ـ حمد علی ـ محمد عباس .

بلاوکەرەوە

ژن ومێردەکە نەبوو بێ منداڵەکە عائدبەوە. لەلایەکی تر ئەگەر دەعواش بکرێ ڕاست نی یە زاتەن منداڵی زیناش بە قەطعی ئیسناد.
وەبال باوکی نادرێ بەلام الحاق دەکرێ بە فیراش کە موطوئەیە. بۆیێ منداڵی زنا ئەگەر کچ بێ بۆ زانی هەیە کچەکەی زنای
مارە بکا چونکی مولحەق نی یە بە باوکی گۆیا بێ باوکە هەر دایکی هەیە بۆیە ئەگەر کوڕبێ نابێ دایکی خۆی مارە بکا بەلام ئەگەر کچ بێ بۆی هە یە شوو بە پیاوە زانی یەکە بکا کەلە ئاوی زینای ئەویش پیدا بووە. چونکی شەرعەن بێ باوکە ئەگەر إقامەی دەعواش بکا باوك بلێ ئەمە کچی منە دەعوایەکەی فاسیدە ـ واتە پووچەڵە.
بەلام ئەگەر کوڕ بێ بۆی نی یە دایکی زانیە خۆی لە خۆی مارە بکا استنباطی ئەم حوکمە مەشروعە لەم حەدیثە پیرۆزە عائد بە نووسەری ئەم دێڕانەیە. ئەگەر لەسەر شێوەی اعتراضی بگوترێ الحاق بە زەمعە وادەگەینی دەبایە سەودە خۆی لێ نەشارتەوە چونکی دەبنە براوخۆشك. موشابەهەش لەگەل عوتبە وا دەگەیەنی خۆی لێ بشارتەوە ئەمە لازم دێ ئەم مەسئەلەیە لەموشتە بەهات بێ چونکی شەبەە لە لایەك موناسەبەی لەگەل حەلال هەیە لە لایەکیش مناسەبەی لەگەل حەرام هەیە هەروەکو شەرقاوی وای فەرموە. بەڵام بەبیری نووسەری ئەم دێڕانەدا واتێ پەری کە ئەمە لە مەسائلی مەشبوهە نی یە بەلکی لەمەسائلی دیارو ظاهرەیە. چونکی فیراش کە قەرینەیەکی زۆر بە هێزترە لەموشابەهە. منداڵەکەی دایە زەمعە. فەرمانی خۆشاردنەوەش بەزەمعە لەبەر ـ احتیاط ـ و خۆپاراستن بووە وە خوداش زانایە بە مەرامی پێغەمبەر (د).

٥٥٢ عَن عائشةَ (ض) سَمّو اللّهَ عَلَيْهِ وَكُلوهُ.

## تەرجەمە

٥٥٢ دەگێڕنەوە لە عائشە ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ قەومێك عەرزی پێغەمبەریان کرد کە قەومێك هەیە هەر جارە گۆشتمان بۆ دێنن نازانین ناوی خوای لەسەر دێنن یان نا. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێوە ناوی خوای لەسەر بینن و بیخۆن.

(ش) لەم حەدیثە پیرۆزە وازاندرا ناو هینانی خۆدا مەرج نی یە بۆ

کوشتنەوەی حەیوان ئەمە بەلگەی ئیمامی شافعی یە. بەلاّم لای ئیمامی ئەعزەم ئەگەر عەمدەن بەقەصد بسم الله تەرك بکەن لە کوشتنەوەی حەیوان خواردنی دروست نییە. بەلاّم ئەگەر لە بیریان چوو بەسەهوو تەرك بکرێ قەی ناکا مەبەستیش لەم حەدیثە (یەعنی ئەی قەومی کە پرسیاردەکەن ئێوە حوسنی ظەنتان هەبێ واتێ بگەن بسم الله یان کردووە ئێوە لەبەر زێدە احتیاط لەسەر گۆشتەکە بلێن بسم اللەی بیخۆن.

٥٥٣ عَن ابي هُريرَةَ: يأتي على الناسِ زمانٌ لايُبالي المرءُ ما اخَذَ منهُ أمِنَ الحلالِ أم مِنَ الحرامِ.

## تەرجەمە

٥٥٣ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە - ڕەزای خودای لێ بی - پیغەمبەر (د) زەمانێك دێتە سەر خەلکی گوێ ناداتێ پیاو مالی لەچی لایەکی بەدەست کەوتوە ئایا لە حەلالی دەست کەوتووە یا لە حەرامی وەرگرتووە.
(ش) لەم حەدیثە وادەزاندرێ کە پێویستە ئێمە لێ بکۆلینەوە بزانین ئەو پارەی ئێمە وەری دەگرین حەلالە یان حەرامە. ئەو حەدیثەش بەلگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی (محمد) (د). چونکە خەبەر دانە بە کارێکی نادیار لە زەمانی پێغەمبەر حەلال وحەرام وەکوو یەك نەبووە. وەکوو ئەم زەمانەی ئێستامان دەلێن هەر دەست کەوتن حەلە سەر چاوەی حەلالّ وحەرامیان لاوەکوو یەکە، خودابمان پاریزی لەمالی حەرام وخودا ڕامان بگری لەسەر سونەتی پێغەمبەری خۆی ویارانی بەرێزی ئەو (نستعیذ بكَ یاربِّ من الحرام وثبّتنا علی سُنّةِ نَبِیِّكَ واصحابِهِ الکرام).

٥٥٤ عَن البَراءِ وزيد ابن أرقم (ض) اِن كانَ يداً بِيَدٍ فلا بأسَ واِن كانَ نَساءاً فلا يَصْلحُ.

## تەرجەمە

٥٥٤ دەگێڕنەوە لەبەرائی کوڕی عازیب وزەیدی کوڕی ئەرقەم - ڕەزای خودای لێ بی - گوتیان ئێمە لە زەمانی پێغەمبەر کە لە ژیاندا بوو. بازرگان بووین دەربارەی صەرافی وپارە هورد کردنەوە پرسیارمان کرد لە پێغەمبەر (د) فەرمووی گۆڕینەوەی زێڕ بە زێڕ یان زیو بەزێڕ ئەگەر

دەستاو دەست بێ یەعنی مەجلیسی وەرگرتن بێ لەیەکتر قەی ناکا. وە ئەگەر بە تەئجیل و دواخستن بێ دروست نی یە.
(ش) لە پارە گۆڕینەوەو کاری صەرافی وەرگرتنی پارە لە مەجلس لە هەردوولا شەرتە بە اتفاقی هەموو زاناو مجتهدەکان بەلام دەربارەی زیاد وەرگرتن یاخۆ بە ناوی صەرافی چونکە پارەی بۆ مورد کردووتەوە شتێکی لێ بستینی. ڕای جیا جیا هەیە. قسەی لە هەموان ڕاست تر ئەگەر گۆڕینەوەی جنس بە جنس بێ زیادە وەرگرتن دروست نی یە وەکوو گۆڕینەوەی زێڕ بە زێڕ یازیو بە زیو بێ. بەلام ئەگەر جنس بە غەیری جنس بێ. وەکوو زێڕ بە زیو یا پێچەوانە. بە مەرجی لە یەکتر وەرگرتن چی بەزیاد چی بەکەم دروستە بەمەرجی ( حلول وتقابض) واتە لەیەک مجلس لەیەک وەربگرن نەک بەدواخستن، بە دەلیلی ئەم حەدیثەو چەند ئەحادیثی پیرۆزی تریش. لەمەپاش دەگەینێ انشاالله.

٥٥٥ عَن أَنَسٌ (ض) مَن سرَّهُ أن يُبسَطَ له رِزقُهُ أو يُنْسَأَ لَهُ في أثرِهِ فليَصِلْ رَحِمَهُ.

**تەرجەمە**

٥٥٥ دەگێڕنەوە لە ئەنەس کوڕی مالك ڕەزای خودای لێ بی. گوتی بیستم لە پێغەمبەر (د) دەی فەرموو هەر کەسێك پێ ی خۆش بی کە ڕزقی فرەوان بی وتەمەنی درێژبی با لەگەل خزمەکانی خۆی باش بی ـ صلەی ڕەحمی ـ هەبی.
(ش) یەعنی چی بەمالّ چی بە خدمەت چی بە زیارەت چی بە نامە گۆڕینەوە پەیوەندی خۆی نەبڕی لەگەل خزم. چی خزمی نزیك چی خزمی دوور لە تەمەنو ڕزقی زیاد دەکرێ. ئەمەش پێچەوانەو منافی نییە لەگەل حەدیثی ـ كُتِبَ رزقُهُ واَجَلُهُ في بطنِ أمِهِ ـ واتە هەرکەسێك رزق وئەجەلی لەزگی دایکی دا نووسراوە. یەعنی نووسراوە بە زیادی رزق وتەمەن ئەگەر صلەی ڕەحمی کرد بێ ئەگەر نا هیچ.

٥٥٦ عَنْ أنس (ض) ما أمسى عندَ آلِ مُحمَّدٍ صلى الله تعالى عليه وسلم صاعُ بُرٍّ ولا صاعُ حَبٍّ.

**تەرجەمە**

٥٥٦ دەگێڕنەوە لە ئەنەس ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ کە جارێك نانێکی جۆو

هەندێ پێ خۆری لە ڕۆن برد بۆ پێغەمبەر (د) زرێ یەکەشی ئەبو الفضولیان پێ دەگۆت لای جوولەکەیەکی مەدینە کە (ابو الشحم) یان پێ دەگۆت لەبەر قەڵەوی ڕەهنی سێ ڕبە جۆ بوو. بۆ هەر نۆ خێزانەکەی پێغەمبەر. بەڕاستی گوێم لێ بوو دەی فەرموو لای خێزانەکانی پێغەمبەرو محمد خۆی ئەما بوو بۆ هێوارێ هیچ شتێك. ئەڕ بەیەك گەنم ئەڕ بەیەك لە دانە وێڵەی تر نۆ ژنیشی هەبوو.
(ش) ئەگەر بگۆترێ بۆچی زرێ یەکەی لای یەکێك لەدەولەمەندانی ئەصحاب ڕەهن نەکرد وەڵام / لەترسی مەمنونیەت نەوەك ئەصحابەکە گەردەنی ئازا بکاو مەمنوون ببی وەهەتا حوکمێکی شەرعیش بەدیار بکەوێ کەدروستە مەامەلە لەگەل جوولەکە ئەگەر چی بەشی زۆری مالیشیان حەرامە. چونکە ڕیبا دەکەن. وەهەتا بشزانرێ کە دروستە مەامەلە لەگەل کەسێك بەشی زۆری مالی حەرامە مادام یەقین نەکا کەئەو مالەی وەری گرتووە لە مالی حەرامە. وە ئەو قسەی پێغەمبەر (د) لەبۆ پاڕانەوە نەبووە کە خودا بە ناچاری ئەمەی بەسەر هێنابی. بەلکی بەخۆشی خۆی دەیکردە خێرو دەی بەشی یەوە بەسەر هەژاران. لێ نەدەگەڕا هیچ شتێکی زێدە لە خۆی ولە عائلەی خۆی بمینێتەوە شەوێ لە غەیری زەخیرەی سالْ. وە ئەم قسەشی کە فەرمووە لەبەر وەقتێکی مەخصوص بەشتێکی تایبەتی بووە. ئەگەرنا لەچەند حەدیثی تر کەدیارە ئاشکرایە. کە زەخیوی سالێکی بۆ ئەهلی بەیت وخانەدانی خۆی داناوە. لەکەمترین شت کە مرۆڤ بتوانێ پێ ی بژی کوجۆ بوو و خورما بووە لە مەدینە.

٥٥٧ عَن المقدام (ض) ما اَكَلَ اَحَدٌ طعاماً قطُ خيراً مِن اَن يأكُلَ مِن عَمل يدهِ وَاِنَّ نَبِيَّ اللهِ داودَ عليه السلام كانَ يأكلُ مِن عَمَل يَدِهِ.

## تەرجەمە

٥٥٧ دەگێڕنەوە لە مقدامی کوڕی مەعدی کەربەی کەندی یەمەنی - ڕەزای خودا لێ بی - فەرمووی پێغەمبەری خودا(د) لەبەنی ئادەم هیچ یەکێك نەی خواردووە خواردنێك باشتربی لە خواردنی خواردنێکی کە بەکاری دەستی خۆی دەستی کەوتبی. (وەجهی باشتری ئەمەیە ١- کەلك گەیاندنە بە کاسبو غەیری کاسب ٢- سەلامەت بوونە لەبێ کاری و بێ ئیشی کەسەر دەکێشی بۆ کاری بێ کەلك ٣- شکاندنی نەفسە ٤- خۆپاراستنە

لەدەست پان کردنەوە لە پێش خەلکی. بەڕاستی پێغەمبەری خودا داوود سەلامی خوای لێ بی حالی وابوو لە کاری دەستی خۆی دەی خوارد.

(ش) چونکی زرێ ی لە ئاسن دروست دەکرد دەی فرۆشتە قەومی خۆی ( ئەگەر چی پێویستی بەم کار کردنەش نەبوو بۆ خواردن چونکە پاشایێکی گەورە بوو خاوەنی شکوەوشەو کەت بوو. پێغەمبەران لەکەسابەت ڕانەوەستاوون پێغەمبەری گەورەمان ( محمد ) (د) لەسەعی وماندوو بوونی خۆی کەپەیدای دەکرد لە جهادی کافران دەی خواردو دەی بەشی یەوە. کە جهادیش لە هەموو کە سابەتێك پیرۆزترە چونکی بۆ سەرخستنی کلمەی خودایە وژێرخستنی دوژمنی خودایە. لە هەندێ کتابی حەدیث هاتووە. ئادەم سەلامی خوای لێ بی خەریکی فەلاحەت بووە (نوح ) دارتاش بووە ـ نجار ـ ئیدریس ـ بەرگ درووبوو(خیاط). موسی شوان بووە (راعی) لەمە بەدیار دەکەوی کەسابەت کردن ڕێك دەکەوێ لەگەل تَوَکُّل ـ واتە پشت بەستن بەخودا ـ چونکی سەعی دەکا ماندوو دەبی هەتا بەری لێ بخوا پاشان ئەگەر چی زۆر جار قازانج دەکاو بەرەکەی دەخوا وهەندێ جاریش وادەبی زەرەر دەکا. ئنجا وەکوو بەتەمای خودا ڕووی لەکار کردن وکەسابەت کرد ئەو تەوەکولە. (یەعنی خودای کردوتە وەکیلی هەموو کاروباری خۆی لە هەموو کارێك یان هەر تەنیا لەم کارە.

٥٥٨ عَن جابِرُ (ض) رَحِمَ اللّٰهُ رَجُلاً سَمْحاً اِذا باعَ واِذا اِشترى واِذا اقتضى.

## تەرجەمە

٥٥٨ دەگێڕنەوە لە جابر ( ڕەزای خودای لێ بی ) بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی خودای گەورە ڕەحم بە پیاوێك بکا دل فەرموان و سەخی بووبێ. وەکوو دەفرۆشی وەکوو دەکرِی وەکوو داوا دەکا حەقی خۆی بە نەرمی وڕوو خۆشی

(ش) لە ڕووی دەرەوەی ئەم حەدیثە ئاگادار کردنەوەیە بەلام لەمەعنادا دوعایە.

٥٥٩ عَن حذيفَةُ (ض) تَلقَّتِ الملائكةُ روحَ رَجُلٍ مِمَّن كان قبلكم قالوا أعمِلْتَ مِن الخيرَ شيئاً قالَ كنت آمُرُ فتيانى اَن يُنظِروا المُعْسِرَ ويتجاوَزوا عَنِ الموسِرِ فتجاوز اللهُ عَنه.

## تەرجەمە

٥٥٩ دەگێڕنەوە لە حوزەیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی مەلائکە پێشوازی رووحی پیاوێکی بەنی اسرائیلیان کرد لە پیش زەمانی ئێوە پیٚ یان گوت ئەری تۆ چیت کردووە لە کاری خێرو چاکە. پیاوەکە وەلامی دانەوە من فەرمانم دەکردە بەندەو خدمەتکارە کانم کەماوە بدەنە هەژارو دەست کورتەکانی قەردارم وە لەگەل دەولەمەندانیش پشی یان فرەوان بی لە دانەوەی تەواوی قەرد. ئەگەر وایان پیٚ خۆش بوو ڕکەبەریان لەگەل مەکەن. ئنجا خودای گەورە لەبەر ئەم صفەتە باشە لە گوناهی خۆش بوو بردیە بە هەشت.

٥٦٠ عَنْ حَكِيم ابن حزام (ض) اَلْبَيِّعان بالخَيَار مالم يتفرَّقا فأن صَدَقا وبيَّنا بورِكَ لهما في بيعهما وإن كتما وكَذَبا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بيعِهما.

## تەرجەمە

٥٦٠ دەگێڕنەوە لە حەکیمی کوڕی حزام (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی کریارو فرۆشیار لە فرۆشتن و کڕینە کەیان قبول وپەشیمان بوونە وەیان بۆهەیە مادام لەیەکدی جودا نەبنەوە لە مەجلیسیعەقد - (پاشان ئەگەر لە مەجلیسی عەقد - بەردەوام بوون واتە ئەگەر هەر لەگەل یەك مانەوە یاخۆ چەند قۆناغێك لەگەل یەکتر ڕۆیشتن هەر لەسەر - هەلبژاردنی خویتیان - بالەسیٚ ڕۆژیش زیاتر بیٚ. پاشان ئەگەر نەگەیشتنە یەکتر لەقسە کردن وئەم کڕین وفرۆشتنە. ئەوەی کەدەلیٚ ئێمە ریك کەوتین لەگەل یەك لەم معاملەیە - ئەو سۆیند دەخوا. چونکی ئەصل ڕێك کەوتنە کڕیارو فرۆشیار ئەگەر ڕاست گۆبوون و ئەوشتی کڕین و فرۆشتنی لەسەرە بە تەواوی و ئاشکرایی ڕۆنیان کردەوەو لە ئەوصافی ئەوشتەو نرخ (واتە هەر عەیبێکیان هەبوو بەئاشکرایی گۆتیان). کەلکی فرۆشراوو نرخەکەی بۆئەوان زۆر دەبی وبە خێرو بەرەکەت دەبن. وەئەگەر فرۆشیار عەیبی فرۆشراوەکەی شاردەوەو کڕیاری شتەکەش عەیبی نرخەکەی شاردەوەو درۆیان کرد خودا کەلك وبەرەکەت لە فرۆشراوەکەو نرخەکەی لادەبا.

(ش) بە کورتی لای امامی شافعی هەتا کڕیارو فرۆشیار بەلەش لەیەکتر جودا نەبنەوە - جودا بوونەوە نابیٚ - بەلام لای ئیمامی حەنەفی وەکوو لە صیغەی عەقد - لەخۆ بوونەوە - جوداوبوونەوە دەبی - مەبەست

... سیغەی عەقد ـ لە تۆم کڕی و فرۆشتمە تۆ. هەلبژاردن وپەشیمان ... ونەوە پاش ئیمزاکردن بۆ هیچیان نامینێ.

٥٦١ عَن أبي سَعيدٍ (ض) لاصاعَيْنِ بصاعٍ ولا دِرهَمَيْنِ بِدِرهَمٍ.

### تەرجەمە

٥٦١ دەگێڕنەوە لە ئەبو سەعیدی خودری. گوتی کەزمکات بە ئێمە دەدرا خورمایەکی تێکەلاو لەچەند جۆرە خورما بوو. ئێمەش لە خورمای هەڕەمەی خۆمان. دوو صاعمان بە صاعێك دەدا لە خورمای تر. ئنجا پێغەمبەر فەرمووی مەفرۆشن دوو صاع بە صاعێك لە خۆرماو خواردنی تریش وەمائیش فرۆشتن دوو درهەم بە درهەمێك یەعنی بۆ جەوازی فرۆشتنی بەیعی ڕەبەوی کە جنسیان یەك بی چلۆن حلول وتقابض شەرتە تەماشلیش شەرتە (واتە چلۆن دەست بە دەست وەرگرتن مەرجە مەرجیشە ئەوشتە یەك ڕەنگ بێ نەك باش و خراپ تێکەلێ یەك بکەی یان شیرو ئاو تێکەل یەك بکەیبەشیر بیفرۆشی(((
(ش) لەم حەدیثە هیچ گومان نامینێ بۆ ئەو کەسەی لای وایە شتی واتێکەلاو باش وخراپ تێکەل یەکتری کرابێ دروست نی یە فرۆشتنی چونکی فەرمووی دوو صالح بەیەك صالح مەفرۆشن مەعنا ئەگەر سەربەسەربی قەی ناکا. چونکی باش وخراپی فەرق دەکرێ. بەلام تێکەلاوێك کە فەرق نەکرێ. وەکوو تێکەلی شیرو ئاو فرۆشتنی دروست نی یە بەشیر چونکی عەیبی دیار نی یە ئەبیتە غەش.

٥٦٢ عَن أبي هُرَيرَةَ(ض) الحِلفُ منفَقَةٌ للِسّلعةِ مُمْحَقَةٌ للبَرَكةِ.

### تەرجەمە

٥٦٢ دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی بیستم لە پێغەمبەر (د) دەی فەرموو سوێندی بەدرۆ ڕەواج دەرە بۆ فرۆشتنی مال لابەرە بۆ کەلکو خێرو بەرەکەت.

٥٦٣ عَن جابِرٍ (ض) جابِرُ ماشأنُكَ ـ إركب تزوَّجتَ بِكراً أم ثيبّاً. أفلا جاريَةً تلاعبها وتلاعبُكَ أما انَّكَ قادِمٌ فاذا قدِمْتَ فالكيْسَ الكيْسَ. اتبيعُ جمَلكَ. الآنَ قدِمْتَ فدعْ جَمَلكَ. فادخُل فصَلِّ رَكعتينِ أدعُ لي جابِراً خُذهُ جَمَلكَ ولكَ ثمَنُهُ.

## تەرجەمە

٥٦٣ دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبد اللهی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی - کەلە غەزای ئوحود شەهید کرا گوتی لە غەزایەك (ئنجا یا غەزای ذات الرقاع بوو یا غەزای تەبووك بوو یا غەزای فەتح بوو) لەگەل پێغەمبەر بووم (د) ووشترەکەم ماندوو ببوو. لەرەفیقان بە پاش کەوتم پێغەمبەر (د) هات گەیشتە من فەرمووی جابر ئەی ووت ئەی جابر، گوتم بەلێ فەرمووی چیت لێ قەوماوە بەپاش کەوتی. پێم گوت ووشترەکەم ماندوو بووە. باش ناڕوا. بۆیی پاش کەوتم پێغەمبەر (د) دابەزی عەصایێکی سەربە قولابی پێ بوو بە عەصایەکە ئەختێکی ڕاکێشا پاشان فەرمووی سواربە. منیش سواربووم بەڕاستی دیتم ووشترەکەم لەبەر زیدە خۆش ڕۆیشتن هەر خەریك بووم ئەم دەمێشت بەپێش پێغەمبەر بکەوی پاشان فەرمووی جابر ژنت هێناوە گوتم بەلێ. فەرمووی کچە یاخۆ بێوەژنە گوتم بێوەژنە فەرمووی بۆ کچێکت نەدەهینا گالتەی لەگەل بکەی ئەویش گالتە لەگەل تۆ بکا. گوتم پێنج خوشکم لە مالێ هەیە حەزم کرد ژنێکی وابینم - خوشکەکانم پەروەردە بکا وەلەگەلی بحەوێنەوە وەپێ یەوە ببژرێنەوە وسەریان بشوا وەخدمەتیان بکا فەرمووی ئاگاداربە ئیستا تۆ دەگەیەوە مالێ خۆت وەکوو گەیشتی یەوە مالێ خۆت دەربارەی جووت بوون (جماع) لەگەل ژنت بەعەقل وهۆش بە. ئەگەر لەحەیز دابوون نزیکیان مەبە (چونکی زەمانێکە لەسەفەر دابووی زۆرت هەوەس لێ یە.) پاشان فەرمووی ئەرێ ووشترەکەت دەفرۆشی پێم گوت بەلێ. ئنجا بەیەك وەقیە زێڕ لێ ی کریم. پاشان پێغەمبەر (د) لەپێش من چووە مەدینە منیش بۆ سبەینە گەیشتمە مەدینە چووینە مزگەوت دیتم تەشریفی لەسەر دەرگەی مزگەوت بوو. فەرمووی ئێستا گەیشتی یە مەدینە گوتم بەلێ فەرمووی دەواز لە ووشترەکەت بێنە بچۆ مزگەوت دووڕکعەت نوێژ بکە منیش نوێژم کرد ئەمری کردە بلال کەوەقیە زێڕەکەم بۆبکێشی. وەقیە زێڕێکی بە گرانی بۆ کێشام. پاشان ڕویشتم ئەختێك فەرمووی بۆم بانگی جابر بکەن بگەڕێتەوە لەناو دلی خۆم گوتم ئێستا پێم دەلێ ووشترەکەت ببەوە. هیچ شتێکیشم لەمە پێ ناخۆشتر نەبوو فەرمووی ووشترەکەت ببەوە نرخەکەشی بۆخۆت.

(ش) لە فرۆشتنی بە شەرت ئیمامەکانی موجتەهید بیری جیا جیایان هەیە چونکی پیغەمبەر (د) ووشتری لە جابر کری لەڕێگا سواریش بوو یەعنی جابر هەتا مەدینە سواربوو ئەمە عادەتەن مەرجێکە. لای ئیمامی ئەحمەد دروستە لای ئیمامی مالکیش ئەگەر ماوە - مەسافە - نزیك بێ

دروسته. لای ئیمامی شافعی ئەگەر کەسێك بلێ من فلان شتم فرۆشت بەمەرجی سواربوون یابە مەرجێکی تر. بەقەطعی دروست نی یە نابێ لە فرۆشتن هیچ مەرج و بەستنەوە هەبێ. لەم حەدیثەش واتێ ناگەین کەشەرت دروستەچونکی پێغەمبەر (د) مەبەستی هەر چاکەیەك بووە لەگەل جابری بکا. مەبەستی کرین و فرۆشتن نەبووە. چونکی جابریش وەکوو بانگی یان کرد تێ گەیشت ووشترەکەی پێ دەدرێتەوە.

٥٦٤ عَن عائشةُ (ض) مابالُ هذه النُمْرُقَةِ قُلتُ إشترَيْتُها لكَ لِتَقْعُدَ عليها وَتَوَسَّدَها فقال انَّ اصحابَ هذه الصُوَرِ يومَ القِيامَةِ يُعذَّبون. فيُقال لهُم أحيوا ماخلقتُم انَّ البيتَ الذي فيه الصُوَرُ لاتدخُلهُ الملائكةُ.

## دەرجەمە

٥٦٤ دەگێرنەوە لە حەزرەتی عائشە رەزای خودای لێ بی. بالیفێکی پال پێدانم کری شکلو صورەتی تیابوو پێغەمبەر(د) ویستی بێتە ژووری چاوی پێ کەوت لە دەرگە راوەستا نەهاتە ژووری عائشە فەرمووی لەرووی پیرۆزی هەستم پێ کرد پێی ناخۆش بوو گوتم ئەی پێغەمبری خودا. من تۆ بەبێ لە بەگوێ نەکردنی ئەمری خوداو پێغەمبەری خودا. پێغەمبەر(د) فەرمووی چی یە ئەم بالیفە (سەرینە) ووتم کریومە بۆتۆ کەلەسەری دابنیشی وەپالێ پێ بدەی فەرمووی ئەهلی ئەم وێنەو صورەتانەی بێ رووح رۆژی قیامەت عەزاب دەدرێن پێ یاندەگۆترێ ئەم وێنانە کە دروستتان کردوونە روحیان بخەنە بەر وە فەرمووی مالێك شکل و صورەتی تیابێ مەلائکە ناچنە ناوی.

(ش) نەك ئەو مەلائکانەی چاکەو خراپەی خەلکی دەنووسن. چونکی ئەوانە جودا نابنەوە لە مرۆڤ لە کاتی (جماع) و (چوونە سەر پێشاو نەبێ. هەروەکوو قورئان سرنج بۆئەو لایەنە رادەکێشن(لەم ئایەتەی کەدەلێ "لَهُ مُعقِباتٌ مِنْ بَينِ يَدَيْهِ ومن خلفِهِ يحفظونَهُ مِنْ أمرِ الله ". بەرۆژ دە مەلایکەن بە شەویش دە مەلایکەن بە نۆبەت. مەبەستیش لەصورەت ووێنە وێنەی حەیوانە. یەعنی ئەوی روحی هەبێ گیاندار بێ. نەك دارو درەخت و رووەك. بەلام وێنەیەك کە لەمەرتەبەی زیلەت دابێ وەکوو وێنەی رایەخ و بالیف وشتی وا مەلایکە دەچنە ئەومالە خطابی گوتیتی گشتی یە لەهەموو صورەتێك) بەلام صورەتێك ئەگەر بۆتەماشا کردن و کات رابواردن بێ ئەگەر هەموو ئەندامێکی هەبێ دروست نی یە ئەگەر هەندێ

ئەندامی نەبێ کەمرۆڤ بێ ی ئەو ژیانی نابێ دروستە بەلام بو خاری شەریف لەئاخری کتاب اللباس. بەگوێرەی ئەم حەدیثە کەلە ئەبو طەلحە دەگێڕیتەوە فەرمویەتی (اَنّ الملائکةَ لاتدخُلُ بیتاً فیه الصورة الا رقماً في ثوبٍ). ئەو شکل و وێنانەی کەلە جلکدا هەیە زیانی نی یە. لەبەریش بکرێ یەعنی وێنەیەك سێبەری نەبێ مستثنایە لە عمومی حەدیثی عائشە: لازمە لەم وەقتەدا کەدموری لاساکردنەوەو وێنەو فوتوغرافە. عالەم خۆی تەقلیدی ئەم حدیثە بکا کە حەدیثی ئەبو طەلحەیە. زاتەن لە زەمانی سلطان عبد العزیز ـ کە یەکێك بووە لە پاشایەکانی دەولەتی عوسمانی ـ شیخ الاسلام توروشوچی زادە فتوای داوە کە حەرام نی یە هەموو وێنەیەك ئەگەر سێبەری نەبێ.

هەروەکوو ضیاءالدین عمری داغستانی وا دەفەرموێ لە شەرحی خۆی لەبو خاری شەریف. بەلام لەم پەرتووکەی خۆمان لە دوایی باسی جلك، ڕوون کراوەتەوە.

٥٦٥ عَنْ اِبنِ عُمَر (ض) بعتیهِ بعیْنِهِ هُوَ لكَ یاعبدَ اللّهِ ابْنَ عُمَرَ تصنَعُ بِهِ ماشِئْتَ.

## تەرجەمە

٥٦٥ دەگێڕنەوە لە عبد الله ی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی گوتی لە خدمەت پێغەمبەر دابووین (د). لە سەفەرێك منیش سواری ووشترێکی سەر ڕەقی چەمووش ببووم ئی مالی باوکم حەزرەتی عومەر بوو. پێ ی نەدەوەستام هەمووکات پێش دەکەوت. حەزرەتی عومەریش لێ ی دەخۆڕیەوەو دەی گێڕاوە. دووبارە بە پێش دەکەوت دووبارە حەزرەتی عومەر دەی گێڕاوە. پێغەمبەر (د) بە حەزرەتی عومەری گوت پێم بفرۆشە. حەزرەتی عومەر پێ ی گوت بێ ئەوەی هیچ بدەی هبەی تۆم کرد ئەی پێغەمبەری خودا دووبارە فەرمووی پێم بفرۆشە حەزرەتی عومەر پێ ی فرۆشت. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی عبد الله ی کوڕی عومەر. ئەم ووشترە بۆتۆ بێ. هەرچی لێ دەکەی کەیفی خۆتە.

(ش): ئەم حەدیثە وادەگەیەنی دروستە تصرفی کڕیار لە مەجلیسی عەقد. لە پێش ئەوەی لەیەك جودا ببنەوە ـ یاخیار بکەن. ئەمەش ڕێك ناکەوێ لەگەل حەدیثی ڕابردوو (البیّعان بالخیار مالم یتفرّقا) جواب دراوەتەوە لێرە خیار بۆ حەزرەتی عومەر نەما. بە قەرینەی قسە نەکردنی وەکوو پێغەمبەر (د) هبەی کرد بە عبدالله.

قسە نەکردنی وسکوت لەمەقامی (رَضیتُ) وە بەزمان. یادەلێن مومکنە پێغەمبەر (د) بە لەش وبەدەن دوور کەوتبێتەوە لە حەزرەتی عومەر بە پێش کەوتنی یاپاش کەوتنی. ئەمە قسەی ئیمامی شافعیە کەبۆ کڕیار تەصەروف لە فرۆشراو لەمودەی خیار دروستێ نی یە. بەلای ئیمامی ئەعزەم بە موجەرەدی ئەدای صیغەی فرۆشتن. بەم تەرزە فرۆشیار بلێ فرۆشتم کڕیاریش بلێ کڕیم. بەکار هێنانی و تەصەروف کردن لەفرۆشراو بۆ کڕیار دروستە. هەرچی لێ بکا، گەڕاندنەوەی فرۆشراویش نامێنێ.

٥٦٦ عَن إبنِ عُمَر (ض) إذا بايَعْتَ فَقُل لا خِلابَةَ.
(وفي رِوايةِ البَيهقيِّ في هذا الحديث زِيادةُ ثمَّ أنت بالخيارِ في كُلِّ سِلعَةٍ إبتَعتَها ثلاثَ ليالٍ)

## تەرجەمە

٥٦٦ دەگێڕنەوە لە عبد الله ی کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی ـ گوتی حەبانی کوڕی مونقذ صەحابەی کوڕی صەحابە بوو ئەنصاری بوو. لە غەزای ئوحودو غەزایەکانی پاش ئەویش لەگەلابوو. ئنجا بە پێغەمبەری گوت دروودی خوای لەسەر بی. من فێلم لێ دەکرێ لە کڕین وفرۆشتن. پیغەمبەر (د) فەرمووی وەکو موعامەلەت کرد. بلێ هیچ حیلە وفێل لەدین نی یە چونکی ئایین ئامۆژ گاریە یەعنی دین ڕاستی یە لەگوفتارو ڕەفتار دەرحەق بەبرایانی دین.

(ش) إستدلال کراوە بەم حەدیثە لەسەر مەزهەبی ئەحمەد لە فرۆشراو سێ یەکی ـ ڕەد دەکرێتەوە. بەسەبەب غبنی فاحش ئەگەر نرخی کوتالەکەی نەزانیبی. ئیمامی شافعی وئیمامی حەنەفی گوتویانە. ئەگەر غبنی فاحش مفسد بوایە بۆ کڕین وفرۆشتن یا إثباتی خیاری بکردایە. پێغەمبەر (د) بەیانی دەکرد. مادام بەیانی نەکرد. دیارە مفسد نی یە ـ وەکوو موفسدیش نەبوو سێ یەکی فرۆشراو ناگێڕ درێتەوە. بەلکی خیاری بۆ هەیە بە مەرج لە کاتی عەقد هەتا سێ شەوو ڕۆژ. نابی زیاتر بی لە سێ ڕۆژ. بەلام لای ئیمامیە لە سێ ڕۆژ زیاتریش بی دروستە ئەم قسەی ئیمامیەش پەسند کراوە (توریشتی گوتیتی بۆیە پێغەمبەر (د) ئەم قسەی فەرموو هەتا ئەو کەسەی شتی لێ دەکڕی تێ بگا ئەم بابەی کەحەبانە لە نرخاندنی قیمەتی کەل و پەل شارەزایی نی یە پێویستە رعایەتی إنصافی لەگەل بکرێ).

٥٦٧ عَنْ عائشةُ (ض) يغزو جيشٌ الكعبةُ فاذا كانوا ببيداءَ مِنَ الارض يُخسَفُ بأوّلِهِمْ وَآخِرِهم. يُخسَفُ بأولِهِمْ وَ آخِرِهِم ثمّ يُبعَثونَ على نيّاتِهِمْ.

## تەرجەمە

٥٦٧ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (ڕەزای خودای لێ بی - پێغەمبەر (د) فەرمووی لە شکرێك بە فکری خراپ کردنی بەیت ڕوو لەکەعبە دەکەن وەکوو دەگەنە بیابانەك لە عاردی مەدینە عاردەکە ڕوو دەبرێتە خوارێ لەئەوەل و ئاخری ئەوانەوە. (واتە هیچیان ڕزگارنابن). حەزرەتی عائشە گوتی عەرزم کرد ئەی پیغەمبەری خودا چلۆن دەبی عەردەکە بە ئەوەل وئاخری ئەوانەوە ڕوو بچیتە خوارێ. بەڕاستی ئەگەر چی لەناو ئەوان هەیە ئەهلی بازارو کڕین وفرۆشتن بەس. لەناویشیان هەیە ئەهلی بازار نەبیو هیچ ئیرادەی خراپ کردنی کەعبەشی نەبی. فەرمووی ڕوو دەبردرێ عەردەکە بەئەول وئاخری ئەوانەوە(یەعنی پیاوە باشەکانیشیان بەهاوڕێ یەتی پیاو خراپەکان گرفتاردەبن. پاشان زیندوو دەکرێنەوە. لەوەقتی حسابیش هەرکەسە لەسەر نی یەتی دڵی خۆی کردەوەی لەگەڵ دەکرێ. (ش): ئەمە ئاگادارکردنەوەیە لەبەدوورکەوتنەوە لەهاوڕێ ی خراپ و ستەمکار. لەزەمانی پێغەمبەریش (د) ئەهلی بازارپان لەڕێزی زالم و ستەمکاران دەژمارد. بۆیە لە موسلم هەیە «أبغَضُ البِلادِ عند اللّه أسواقها». ئەو لەشکرەی لەبەینی مەدینە و مەکە ڕوودەچی لەشکری سوفیانی یە هیچ لەشکری ترنی یە موسلم لەجەعفەری کوڕی باقر وانەقل دەکا بە أستنباط لەم حەدیثەی وافەرمووە.

٥٦٨ عن أنس. سَمّوا بأسمي. ولاتكنّوا بِكُنيتي.

## تەرجەمە

٥٦٨ دەگێرنەوە لەئەنەسی ڕەزای خوادای لێ بێ. گوتی پێغەمبەر(د) تەشریفی لە بازار بوو پیاوێك بە پیاوێکی گوت یا ابا القاسم پێغەمبەر (د) ئاووڕی دایەوە. پیاوەکە گوتي مەبەستم تۆ نەبوو ئەی پێغەمبەری خودا مەبەستم ئەو پیاوێهێ بوو. : پێغەمبەر (د) فەرمووی بەناوی من ناولەخۆتان بنێن. بەلاّم کونیەی تایبەتی خۆم وەکو أبو القاسم یاخۆ أبو الزهرا مەئەلەن مەگێڕن بەکونیە بۆخۆتان.

٥٦٩ عن أبي هريرة (رض) أثمَّ لكعُ أثمَّ(١) لكعُ اللّهُمَّ أحبْه وَ أحِبَّ مَنْ يُحِبُّه.

## تەرجەمە

٥٦٩ دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی ڕۆژێك لەكاتی گەرما پێغەمبەر(د) تەشریفی فەرمووە دەرێ. منیش لەخدمەتی بووم نە ئەو قسەیەكی لەگەل من كرد ئەمنیش لە شەرم وەهەیبەت قسەیێكم كرد، هەتا چووە بازاڕی قەینەقاع. پاشان وەكوو گەڕاوە لەساحەی پێش ماڵی فاطمەی كچی ڕەزای خودای لێ بی دانیشت. دوو جار فەرمووی ئەرێ لەوێ یە منداڵە بچووكەكە. ئەرێ لەوێ یە منداڵە بچووكەكە مورادی پێ حەزرەتی حسن بوو (ڕەزای خودای لێ بی) حەزرەتی فاطمەش (ر) نەختی حەسەنی تەئخیر كرد لام وابوو لەبەرئەمەبوو هەندێ. بێنی خۆشی پێوەر كرد. دەست و دەم و چاوی شووشت ئنجاڕەوانی كرد بۆلای پێغەمبەر (د) ئەوەندی هێزی هەبوو بە توندی غاریدا بۆلای فەخری عالەم (د) هەتا دەستی لەملی باپیری كرد وەماچی كرد پێغەمبەریش (د) لەباوەشی كرد فەرمووی یارەبی ئەمەت خۆش بوێ. وەخۆشیشت بوێ هەركەسی ئەمەی خۆش دەوێ.

٥٧٠ عَن أبن عمر (رض) مَنْ إبتاعَ طعاماً فَلاَ يَبيعهُ حتّى يَسْتَوفِيهُ.

## تەرجەمە

٥٧٠ دەگێرنەوە لەعبداللەی كوڕی عومەر- ڕەزای خودایان لێ بی. پێغەمبەر(د) فەرمووی هەركەسێك خواردنێك بكڕێ نەفرۆشێتەوە هەتا لە كریاری وەرنەگری.
لەمە ئەهم كرا كریار نابی فرۆشراو بفرۆشی هەتا لەفرۆشیاری وەرنەگرێ. قیاسی لەخواردن كراوە ئەشیای تر هەر چی بێ. فرۆشراوەكە شایانی گواستنەوەبێ یان شایانی گواستنەوە نەبێ. (یەعنی مەنقول بێ یاغەیرە مەنقول). ئەمە لای شافعی و ئیمام زەفرە بە أستنباط لەم حەدیثە وایان فەرمووە. بەلام ئیمامی ئەعزەم و ئیمام یوسف گوتیانە ئەگەر فرۆشراوەكە عارد بێ كریار پێش وەرگرتنی ئەتوانێ بی فرۆشێ بەلام ئەگەر شایانی گواستنەوە بێ (منقول) ناتوانێ بیفرۆشێ.

---

(١) لكع : الصبي الصغير ( مندالی كچكە ) . المنجد - طبعه العشرون - ص٧٣٢ .

٥٧١ عن جابر (ض) إذهَبْ فصَّنف ثمرَكَ أصْنافاً العَجوَة على جِذَةٍ وَ عذْقَ زَيْدٍ على جِذَةٍ ثمَّ أرسِلْ اليَّ كِل لِلقُومِ.

## تەرجەمە

٥٧١ دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی باوکم کە عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی حەرام بوو. لەغەزای ئوحود شەهید کرا. لەلایەن جوولەکان، قەرزێکی زۆری لەسەر هەبوو منیش چوومەلای پێغەمبەر(د) دەخالەتم پێ کرد یارمەتییەکم بدا بەلکی خاوەن قەردەکان لە قەردەکانیان شتێك کەم دەکەنەوە. پێغەمبەریش داوای لێ کردن هیچیان لێ کەم نەکردەوە. ئەمری بەمن فەرموو بچۆ چەند نەوعە خورمات هەیە جودا جودا بکە کۆمەڵ. عەجوە(واتا خورما وشکە کەنەوعە خورمایەکە). بەجودا.عەذق زەید بەجودا (یەعنی باش وبەد تێکەڵ یەکتریان مەکە. پاشان لەدوای من بنێرە. منیش هەرچۆنی ئەمری فەرموو وام لێ کرد. ناردمەشوین پێغەمبەر (د) تەشریفی فەرموو هات لەسەرینگانی کۆمەڵە خورمایەکان دانیشت. فەرمووی بپیوە خورمایەکان بۆ خاوەن قەردان. منیش بۆم پیوان. هەتا هیچ لەقەردەکانی باوکم نەما. پاشان وەکوو تەماشام کرد. کۆمەلە خورمایەکان گۆیا هیچیان لێ دەرنەچووە. بەتەواوی هەمووی ماوە (ش) ئەمەیش بوە موعجیزەیەك لە موعجیزە ئاشکرایەکانی. لەمەوا دەزاندرێ و فەهم دەکرێ کەپێوان لەسەر ئوکەسەیە کەدەیدا.

ئنجا چی فرۆشیاربێ بداتە کڕیار چی قەردار بێ بداتە خاوەن قەرد. ئەگەر خۆی پێ ی نەکرا بپیوی دەبێ کرێ بداتە یەکێك بۆی بپیوی.

٥٧٢ عَن المقدامِ أبنِ معدى كرِبَ (ض) كيلوا طعامَكُمْ يُبارَكْ لكُمْ.

## تەرجەمە

٥٧٢ دەگێڕنەوە لەمیقدام کوڕی مەعدی کەریب ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر(د) فەرمووی زەخیرە و خواردنی خۆتان بەعەیارێك یا بەقاپێك بپیوون لەلایەن خودا بەرەکەتی دەکەوتێ.

(ش) ئەوەی کە دەپێورێ و ئەوەی کەدەکێشرێ و ئەوەی کە دەژمرێ و ئەوەی کە دە چیندرێ و هەرچلۆنی بەکیلو بەکێش و ژمارو بەگەز فرۆشتیان ڕاستە. ئەم حەدیثە پیرۆزە مەحموولە وەسەر أستحباب واتە

وای بەچاك زانیوە. چونكی ئەمرەكەی قەطعی نیە بەلكی فەرموویتی بەرەكەتی دەكەویتی بەلاّم لەبەیعی ڕەبەوی كەجنس بەجنس بی واجبە. دانانی نرخ و ئەوەی نرخی بۆ داندراوە بەعەیار بە جوزاف جائز نی یە واتە گۆترە. چونكی ئەت وا نابی دوو كۆمەڵە گەنم مەثەلەن بێ پیوان هەندی یەكتر بن. چونكی لەگەل أشتراطی حلول و تقابض ـ واتە دانان و هەڵگرتن ـ مەرجەوەكوو یەكتربن. بەلاّم ئەگەر جنسیان وەكوو یەك نەبێ وەكوو جۆ بەگەنم دروستە بەلاّم واباشە بپیورێ.

٥٧٣ عَن عبداللة أبن زيدٍ (ض) إنَّ أبراهيم حَرَّمَ مكّةُ وَدَعالها وَ حرَّمتُ المدينَة. كما حرَّم أبراهيمُ مكّة وَ دعَوتُ لها في مُدِّها وَ صاعِها مِثلَ ما دَعا أبراهيمُ لِمكّة.

## تەرجەمە

٥٧٣ دەگێڕنەوە لە عبداللەی كوڕی زەیدی ئەنصاری نەجاری ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی ئیبراهیمی خەلیل سەلامی خوای لێ بی. ڕێزوحورمەتی مەكەی گرتووە چونكی لای خودا بەڕێزە. دووعاشی بۆ كردووە. منیش مەدینەم گیراوە بە حەرەم كەڕاوی نیچێری لێ نەكرێ. وەكوو مەكە چلۆن أبراهیم گێرای بەحەڕەم بەتەحریمی خودا دوعاشم بۆمەدینە كردووە خودا بەرەكەت بخاتە ئەوزادو زەخیرەی كەبەمست یابەعەیار بپیورێ وەكوو دوعاكردنی أبراهیم بۆمەكە.
(وەرگێر) خودای گەورە دەرحەق بە مەكەو مدینە دوعای أبراهیم و دوعای فەخرێ عالەمی قبوول كرد چونكی لە كاتی حەج. لای كەم كەس دووسەد سێسەد هەزار نفووسی حەجاج. لەهەردو حەرەم كۆدەبیتەوە لەگەڵ ئەم هەموو كۆبوونەوە گەورەش لەوێ. خواردنو گۆشتو سەوزە لە غایەتی زۆریدایە.

٥٧٤ عَن عُمر(ض) الذَّهَبُ بالذَّهَبِ رِبا الآهاءَ وَهاءَ وَالبُرَّ بالبُرِّ ألآ هاءَ وَ هاءَ. والتمرُ بالتمرِ رِبا الآهاءَ وَ هاءَ. وَ الشعير بالشعيرِ رِبا. الآهاءَ وَ هاءَ.

## تەرجەمە

٥٧٤ دەگێرنەوە لە حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د). زێر

بەزێر لەریوایەتێکیش یابەزیو: ڕیبایە وەحەرامە لەم صورەتە نەبێ. کەفرۆشیار بلّی هاوەرگرە. کڕیاریش بلّی هاوەر گرە لەفظی ها أسم الفعل ە. مەعنا خذ: لەکوردیش (ها) بێ هەمزە وایە. گەنم بەگەنمیش ڕیبایە. مەگەر موتەعاقیدەین واتەکڕیارو فرۆشیار لەمەجلیسی عەقد واتە ئەنجومەنی پێك هاتن هەردوویان بەیەکتری بلّێن هاوەر بگرە. خورما بە خورما ڕیبایە.

الا مەگەر بایع واتە فرۆشیار بلّی ها یەعنی وەرگرە موشتەریش واتە کریار بە بایع بلّی ها. جۆ بە جۆ حەرامە الا مەگەر بایع بلّی ها موشتەریش بلّی ها. (ش) دەلیل (بەلّگە) لەسەر پێك نەچوون و موغایەرەی جنس گەنم لەگەل جنسی جۆ ئەم حەدیثە یە لای ئیمامی شافعی و ئیمامی ئەعزەم فوقەهای محدثین وغەیری ئەوانیش لە متقدمینان (واتە زانا کانی پیشوو) هەردوویان یەك صنفن. بە أتفاق دەرەو برنج هەر یەك صنفێکن لە یەکتر جودا. لای لەیثی کوڕی سەعدو أبنی وەهبی. مالکی نەبێ گوتوویانە هەردوویان صنفێکن لەیەك جودانین.

٥٧٥ عَنْ أبي هُرَيرَة (ض) نهى رسول اللة صلى اللة تعالى عَلَيْةِ وسلم. أن يبيعَ حاضِرٌ لِبادٍ. وَلاتناجَشوا وَلايبيعُ الرَّجلُ على بيع أخيهِ وَ لايخطُبُ علىٰ خِطبةِ أخيهِ ولاتَسْئلُ المرءَةُ طلاقَ أختِها لتكفَأ ما في أناءِها.

## تەرجەمە

٥٧٥ دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) بەنەهییێکی تەحریمی نەهی فەرمووە. کەخەلّکی شار بەدەلالی ئەشیا بۆخەلّکی دێهات و دەرەوەی شار بفرۆشی بەم تەرزە پێ ی بلّی: تۆ ئەشیای خۆت وەکو ماست و ڕۆن و هێلکەی خۆت لای من بە جێ بیلە من بۆ تۆ بەقیمەتێکی باش ئەی فرۆشم ئنجا ئەوەی نەهی لێ کرابێ ئەم قسەیە. ئەکەرنا فرۆشتنەکە ڕاستە. تناجشیش مەکەن.(یەعنی فرۆشیار وکریار خەریکی پێك هاتن بن یەکێکی تر لەدەرەوە بێ. بەبێ ئەوەی بی یەوێ ئەوشتەبکڕی بلّی من ئەمەندە زیاتری پێ دەدەم بۆ فەریب دانی کریار وە پیاوێکیش. نەفرۆشی لەسەر فرۆشتنی برای خۆی بەم تەرزە. بەکریار بلّی لەکاتی خیار المجلس یا خیار الشرط تۆ موعامەلەکەی خوت فەسخ بکەوە، من مالێکی باشترت پێ دەفرۆشم بەو قیمەتەی کەئەومالە خراپەت پێ کڕیوە یابەکەمتر. یاخۆ بەفرۆشیار بلّی تۆ ئەم مالە

مەفرۆشە بەم قیمەتە من بەزیاتر لە تۆ دەکرم. داخوازیش لەسەر داخوازی حەرامە. (بەم تەرزە پیاوێك ژنێکی خواستبی لە مارەیی و هەرشتێك پێك هاتبن. تەنیا مابێ مارە بکری. یەکێك لە کەس و کاری ژنەکە بڵی یا بەو کەسە بڵی کە ژن مارە کردنەکەی بەدەستە(وەلی) ژنەکە. تۆ کچی خۆت بدە بە من بەزیاتر لەو صداقی کە دیارت کردووە بۆ ئەو (باس کردنی برا (أخ) مەبەستی پێ برانی یە بەلکو بۆ ئەدەب و موجامەلەیە بەداخوازی کەری پێشوو) ئەگەر نا کافریش وەکوو موسلمانە لەم حوکمە).

بامیچ ژنێکیش داوا نەکا لەمیچ پیاوێك کەژنی خۆی تەلاق بدا هەتا ئەو مێردی پێ بکا و ئەوی لەناو قاپی خوشکەکەی دامەیە وەری بگێرێ وتووشی زەرەر ببی.

لای ئیمام شافعی و حەنەفی ئەم موعامەلانەی گوتراو ئەگەر چی گوناهن بەلام فرۆشتنەکان ڕاستن. کریار لە وەرگرتن و وەرنەگرتنی فرۆشراو سەرپشك(موخەیەر) نی یە. بەلام لەگەل تەعزیرو فەریبدان (هەل خەلەتاندن)غبنی فاحشیش هەبێ یانەبێ سەرپشکە (موخەیەر) لای ئیمامی ئەحمەدیش ئەم کرین و فرۆشتنە بە هیچ جۆر ڕاست نی یە. ئیلا لەم صورەتە نەبێ. کە فرۆشیار لە فێل وفەریب دانەکە - هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بێ. بەلکی یەکێك لەدەرەوە بۆهەل خەلەتاندنی کریار نرخی فرۆشراوەکەی زیاد کردبێ سەربەخۆی. ئەو کاتە لای ئیمامی ئەحمەدیش فرۆشتنە کە ڕاستە وەکوو ئیمامی شافعی وحەنەفی.

٥٧٦ عَنْ جابِر (ض) مَن يشتريه مِنّي.

## تەرجەمە

٥٧٦ دەگێرنەوە لەجابری کوری عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی أبو مەذکوری ئەنصاری بە (تەدبیر) عەبدی خۆی ئازاد کرد یەعنی پێ ی گوتبوو پاش مردنی من تۆ ئازاد بە پاشان موحتاج بوو کەبیفرۆشی. پێغەمبەر(د) عەبدەکەی وەرگرت بە صورەتی موزایەدە فەرمووی کێ ئەم عەبدەم لێ دەکرێ. نوعەیمی کوری عەبدوللای نەحامی عەدەوی قورەیش بە هەشت سەد دەرهەمی کری. پێغەمبەریش پارەکەی دایە مودەبیر. کەئەبو(مذکوری ئەنصاری بوو). لەم حەدیثە پیرۆزە وا زاندرا فرۆشتنی هەرشتێك بەموزایەدە دروستە لاي ئیمامی شافعي و ئیمامي ئەحمەد بە دەلیلی ئەم حەدیثە دروستە. فرۆشتنی عەبدی (مدبّر)

لەکاتی پێویست بەتایبەتی لەکاتەکی خاوەنەکەی هیچی نەبیّ. لای ئیمامی ئەعزەم وئیمامی مالك دروست نی یە. وەلەپاش وەفاتی گەورەکەی خۆی سەربەخۆی ئازاد دەبی بەلاّم هەتا گەورەکەی (سیدەکە) مابی لەژێر حوکم و تەصەروفی گەورەکەی خۆیتی (ش) بە نوعەیم کوڕی عبدالله یان دەگوّت نەحام چونکە بەمەعنا کۆکەیە. پێغەمبەریش فەرموو بووی چوومە ناوبەهەشت لەویّ گوێم لەکۆکەی نوعەیمی کوری عبدالله بوو. ئنجا مەشهور بوو بەنەحام لەموسلمانەکان قەدیم بوو. بەلاّم لەمەکەمایەوە هەتا کەمێك پێش فەتحی مەکە. چونکی قەومەکەی لەبەرشەرەف و قەدری خۆی لەبەر سەخیاتی و بەخششی خۆی لیّ نەگەران لەناویان باربکا پیّ یان گوت لای ئێمە مەرۆ. لەسەر هەر دینێکی کەیفی خۆتە. وەکوو بەخدمەت پێغەمبەر گەیشت دەستی لەمل کردو ماچی کرد. لەساڵی پازدەی کۆچی لەغەزای یەرمووك شەهیدکرا.

٥٧٧ عَن أبی هُریرَةَ (ض) مَن إشْتری غَنماً مُصَّراةً فَاْحتَلَبَها فأنْ رَضیَها أمسَكها وَ إنْ سَخَطها ففي حلبتِها صاعٌ مِنْ تَمرٍ.

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە ـ رەزای خودای لیّ بی ـ پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسێك مەرێك بکری. چەند رۆژێك نەدۆشرابی بەحیلە هەتا گوانی گەورە دیاربی گۆیا زۆر بەشیرە. پاشان کریار مەرەکەی دۆشی فێلەکە بەدیارکەوت ئنجا ئەگەر بەمەرەکە رازی بوو. دەی گێرێتەوە بۆخۆی نایداتەوە فرۆشیارەکە. وەئەگەر پێشی را ز ی نەبوو. مەرەکە دەداتەوە فرۆشیار. لەجیاتی شیرەکەی دۆشراویش صاعێکە لەخورما ئەبی لەگەل مەرەکە بداتە فرۆشیارەکە.

(ش) ئیمامی شافعی و ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی مالك بەم تەرزە کاریان بەظاهری ئەم حەدیثە کردووە. بەلاّم ئەگەر لەپێش دۆشین تەصریەی مەرەکە زاندرا. (واتە زاندرا کەبەفێل ئەو ماوە نەدۆشراوە هەتا گوانی گەورە دیاربی) تەنیا مەرەکە دەگەرێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی. بەلاّم لای ئیمامی ئەعزەم گوتیتی لەپاش دۆشین نەمەرەکەی ـ نەدۆشراو ـ واتە ـ مُصَرّاة ـ نەشیر نەخورما ناگەرێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی. چونکی کریاری فەریب دراو جهەتی خیار و هەلبژاردنی بە قەطعی بۆنی یە. وە مەرەکەشی کردە ئی خۆی. یەکێك لەزەوائدی منفصلەی فرۆشراوەکە واتە ئەوشتە زیادەی کەلەفرۆشراوەکە جیاکرایەوە کەشیرەکەی

دۆشراوە. مانعە بۆ گەڕاندنەوەی بۆ لای فرۆشیار. بەڵام ئەگەر بلێ ی لەم فرۆشتن و کڕینە تەغریرو غەبنی فاحش هەیە واتە هەڵخەڵەتاندن و زیان پێ گەیاندن هەیە ئەمە مەسئەلەیەکی ترە. أختلافاتی ئەمەش لەمەپێش ڕەت بوو لەوێ بۆخۆت تەماشابکە لەباسی (تناجش).

٥٧٨ عَن أبن عَبّاس (ض). لاتَلَقّوا الرُّكبانَ ولايبيعُ حاضِرٌ لِبادٍ. (يعنى لايكونُ له سِمْساراً أيْ دلآلاً).

## تەرجەمە

٥٧٨ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر(د) فەرمووی. مەچوون بۆ پێشوازی ئەوانەی خەلکی دەرەوەی شارن وەکوو بۆفرۆشتنی ئەشیای خۆیان ڕوو لەشار دەکەن بەکاروان. وە ئەهلی شاریش باشت نەفرۆشی بۆ ئەوانەی لە گوندان دەژین بە کوڕی عەباسیان گوت ئەم قسە مەعنای چی یە؟

گوتی یەعنی بابۆخەڵکی گوندان نەبنە دەلال. لای ئیمامی شافعی و حەنبلی ئەو وەقتە حەرامە دەلالی کەخەڵکی شار خەلکی دەرەوەی شار مەنع بکا لەفرۆشتن. بەم تەرزە پێ ی بلێ شمەکی خۆت لای من دابنێ. تابەرەبەرە بە قیمەتێکی گران بۆت بفرۆشم. شمەکەکانیش لەوانەبن خەلکی شار پێوستی یان بێ. ئەگەر نا یەعنی ئەگەر یەکێك لەم دوو شەرتە نەبوو حەلالە. وەئەگەر کابرای خەلکی دەرەوەی شار بەوەی شارستانی گوت لای تۆی دادەنێم کەبەرەبەرە بۆم بفرۆشی. دیسان حەرام نی یە. لای شافعی بامەکروهێکی تەحریمیش بێ فرۆشتن باطل نابێ. بەڵام ئیمامی حەنەفی تەخصیصی کردووە نەهی لەم حەدیثە بەزەمانی قاتی وگرانی لەزەمانی هەرزانی دا مەکروهیش نی یە چی جای حەرام بی. پاشان لەبەینی ئیمامی شافعی وئیمامی ئەحمەد فەرقێك هەیە. ئیمامی شافعی گوتیتی بەو شەرتانەی باس کران فرۆشتنەکە ئەگەر چی صەحیحە و ڕاستە بەڵام مەکروهێکی تەحریمیە. ئیمامی ئەحمەدیش گوتی تی بەو شەرتانەی باس کران فرۆشتنەکە ڕاست نی‌یەو ناصەحیحە. ئەگەر یەك لەو مەرجانە نەبوو ڕاستە.

٥٧٩ عنِ إبن عمر (ض) لايَبيعُ بَعضُكُمْ على بَيعِ بَعضٍ ولا تلقّوا السِّلعَ حتى يُهبَطَ بها الى السّوقِ.

## تەرجەمە

٥٧٩ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی بامەندێکتان بەسەر فرۆشتن و موعامەلەی مەندێکی ترتان مەلنەوەستن. وە بەپیر کوتالیشەوە بۆ دەرەوەی شار مەچوون. بەقەصدی کڕین. هەتا داخلی بازاڕ دەکرێ چونکی ممکنە فرۆشیار نرخی ئەوکاتە نازانێ فەریب دەدرێ.

٥٨٠ عَن أبي بكرَة (ض) لاتبيعوا الذهَبَ بالذَّهبِ الآسواءاً بسَواءٍ. والفضةُ بالفضةِ الآسواءاً بسواءٍ. وبيعوا الذَهَبَ بالفضَّةِ. والفِضَّةُ بالذَّهَبِ. كَيفَ شِئتم.

## تەرجەمە

٥٨٠ دەگێرنەوە لەئەبی بەکر کوڕی حارثی ثەقەفی (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی. زێڕ بەزێڕ مەفرۆشن. بەیەکسانی ومساوات نەبێ وەزیویش بەزیو مەفرۆشن بەمساوات وسەربەسەر نەبێ. (یەعنی لەهەموو فرۆشتنەکی ڕەبەوەی لە نەقدو لە طەعام سێ شت بەشەرت گیراوە ئەگەر جنسیان یەك بێ. وەکو زێڕ بە زێڕ گەنم بە گەنم مەثەلەن. حلول و تقابض و تماثل. واتە ئامادە بوونو وەرگرتن وبەیەك چوون وەبیشفرۆشن زێڕ بە زیو. یان زیو بە زێڕ. لەپاش تەحەقوقی حلول و تقابض. هەرچلونێکی حەزتان کرد بەبێ إعتباری مساوات. لەکێش وکیلو و ژمارە و شتی تریش.

٥٨١ عَن ابى سعيد (ض) لاتبيعوا الذَّهَبَ بالذَّهَبِ الآ مثلاً بِمثلٍ ولا تُشِفّوا بَعضَها على بعضٍ ولاتبيعواالورِقَ بالوَرِقِ الآمثلا بمثلٍ. ولاتُشِفّوا بعضها على بعضٍ. ولاتبيعوا مِنها غائباً بناجزٍ.

## تەرجەمە

٥٨١ دەگێرنەوە لە ئەبوسعیدی خودری - ڕەزای خودای لێ بی. زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن بەمساوات نەبێ. نەکەن لایەك لەلایەك زیاتر بێ(لە إشفافە أي لاتفضّلوا). وە مەیفرۆشن زیو بە زیو. الامەگەر هەردوویان وەك یەکتری بن نەکەن زیاتر بکەن یەکێکیان لەسەر ئەوی تر وە مەیفرۆشن

وەكۆڕنەوە زێڕو زیو بەم تەرزە یەكێك مەوجودبی یەكێكیش غائب بی. ئەگەرنا فرۆشتن وگۆڕینەوەكە دروست نی‌یەو حەرامە.

٥٨٢ عَن أسامة. لاربا الآ في النَّسيئَةِ.

## تەرجەمە

٥٨٢ دەگێرنەوە لە أسامەی كوڕی زەید - ڕەزای خودای لیٚ بی - گوتی پێغەمبەر(د) فەرموویەتی لەفرۆشتنی پارەو خواردەمەنی لە حازر بەقەرد نەبیٚ ریبانی یە بەلاّم ئەگەر یەكێك موءجەل بیٚ بایەك لەحەزەش بیٚ حەرامە: یەعنی گەنم بەگەنم یاخۆ زێڕ بە زێڕ مادام هەردوویان لە مجلس پێشین تەسلیم بكرێن بایەكێكیشیان لە یەكێكیان زیاتر بیٚ(ڕیبا) نی یە. بەلاّم بە إجماع كاركردن بەم حەدیثە نەكراوە لەبەر غلەبەی حەدیثەكانی مخالفی ئەم حەدیثە یاخۆ گوتراوە ئەم حەدیثە دەر، حەق بە فرۆشتنی نەقدو خواردەمەنی یە كەجنسیان یەك نەبیٚ وەكوو زێڕ بە زیو یاگەنم بە جۆ بیٚ بە پێچەوانەش چونكی لەمانەدا حلولو وتقابض شەرتی صحەت وراستی یە. باوەكوو یەكیش نەبن لە كێش و عەیار - یەعنی یەكێك لەیەكێكیان زیاتر بیٚ بەراستی ئەم حەدیثە أبن عەباس لەئوسامەی بیستوە. پاشان وەكوو گەیشتنە یەك لەگەل ئەبو سەعیدی خودری ئەم حەدیثەی بۆخوێندەوە كە بەیەك چوون (تماثل) موعتەبەرە. أبن عباس فەرمووی أستغفرالله وأتوب اليه لەریوایەت كردنی ئەم حەدیثە جارێكی تر ئنجا بەشدەت نەهی دەكرد لە تەفاضل: هەندیٚ لە زانایان بیٚ مناسبە بەدەلیلی ئەم حەدیثە فتوایان بە حەلال بوونی ڕیبا داوە یەكێك لەوان مفتی پیشووی مصر محمد عبده بوو كەبەسەبەب ئەم فەتوایە خۆی كردە هەدەفی طەعنەو تەشنیعی عولەمای عالەمی إسلامی.

٥٨٣ عَن ابنِ عمر (ض) لاتبيعوا الثَّمرَ حتّى يَبْدُوَ صَلاحُهُ ولاتبيعوا الثَّمرَ بالتَّمْرِ.

## تەرجەمە

٥٨٣ دەگێرنەوە لەعبداللەی كوڕی عومەر ڕەزای خودایان لیٚ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی مەفرۆشن بەری داران. هەتا بەكەلك هاتنی بەدیاردەكەوی یەعنی هەتا بەكەلك خواردن دیٚ لەسەر تام و لەزەتی خۆی). وەمەیفرۆشن بەروخورمابەدارەوە دەبی خورمای لەداركرا بێتەوە لەعارد بیٚ. چونكی

لەفرۆشتنی خواردنێك بەخواردنێك کەجنسیان یەکبی تەماثل شەرتە (واتە بەیەك چوون) تەماثلیش ئەو کاتە دێتە جێ. هەردوو خواردنەکان ووشك کرابنەوە لێرەیش یەکێکیان بەدارەوەیەو تەڕە.
لەبەینی ئیمامی حەنەفی و ئیمامی شافعی لەبڕگەی یەکەمی حەدیث اختلاف هەیە قسەی ئیمامی شافعی ئەمە بووکە نووسرا لەتەرجەمەی ئەم حەدیثەی ئێستا. بەڵام ئیمامی حەنەفی گوتیتی بەری داران بەکەلکی خواردن هاتبی یانەهاتبی فرۆشتنی ڕاستە چونکی لای حەنەفی ـ بەکەلك هاتن بریتی یە لە ئەمین بوون لە ئافەت وفەساد بانەهاتبیتە خواردنیش.
ئەم حەدیثە ئەگەر چی هەرلەخورمای تەڕو ووشك دوایە لەبڕگەی دووەمی: بەڵام بە قیاسی شمولی لەسەر ترێ و مێوژی ووشك هەیە. چونکی هەردوکیان زەکاتیان تیایە.

٥٨٤ عنْ زيد أبنِ ثابت (ض) فأمّالا فَلا تُبتاعوا حتّى يَبدوَ صلاحُ الثّمرِ كالمَشوْرَةِ يُشيرُ بِها لِكثرةِ خصومَتِهم.

## تەرجەمە

٥٨٤ دەگێڕنەوە لەزەیدی کوڕی ثابتی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی. ئەحوالی عالەم لەزەمانی سەعادەت وابوو لە پێش پێ گەیشتنی خورما بەدارەوە موعامەلەی بەرەکەیان دەکرد وەکوو کاتی لێ کردنەوەی خورما دادەهات خاوەن حەقەکان بۆ داوای حەقی خۆیان کۆ دەبوونەوە ئنجا دەیانگوت ئەم خورمایە تووشی عیلەتی (دُمان) هاتووە واتە بێنی گوڕاوە ڕەش دا گەڕاوە یاخۆ دەیان گوت تووشی عیلەتی قوشام هاتووە عەیبێکە لەخورما پەیدا دەبێ. خولاصە عەیبێکی زۆریان لەخورمایەکە دەدیتەوە کڕیارەکان هەتا بەدەرەجەیەك ناکۆکی یان دەکەوتە بەینێ دەهاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) کڕیارەکان أحتجاجیان بەم عەیبا نەدەکرد. ئەم ناکۆکی یە زۆر ڕووی دەدا پێغەمبەریش (د) فەرمووی ئەگەر ئێوە واز لە کڕینی خورمانەینن چونکی موشتاقی کڕینن موعامەلەی بەری دارمەکەن هەتا وای لێ دی دەخورێ لەسەرتام ڕەنگی خۆی. ئنجا زەیدی کوڕی ثابت فەرمووی ئەم نەهیە تەنجیزی نەبوو لەلایەن پێغەمبەر (د) بەلکی ئەم نەهیە وەکوو اشارەی پرس پێکراوێکی باشە. بۆنەهێشتنی ناکۆکی. چونکی مێوە وەکوو باش پێگەیشت باش و بەدی هەمووی بەدیار دەکەوی لەکڕین و فرۆشتن و کڕیارو فرۆشیاری ماوەی ناکۆکی یان نامینێ.

لای ئیمامی ئەعزەم بەری دار پێ گەیشتبی فرۆشتنی ڕاستە لای ئیمامی شافعی شەرتی ڕاستی فرۆشتنی بەری دار پێ گەیشتنە نەمی لەم حەدیثەش بالە مەقامی پرس پێ کردنیش بی یەعنی تەنجیزی و فەرمان پێ کردن نەبێ چەند حەدیثی تر ئەوە دەگەینن کەڕاست نی یە فرۆشتنی بەری کاڵ و پێ نەگیشتوو بەداری وە.

٥٨٥ عَنْ أبي سعيد الخدري وَابي هريرةَ (ض) أن رَسول اللة صلى اللة تعالى علية وسلم إستَعملَ رَجُلاً على خيبرَ فجاءَهُ بتَمرٍ جَنيبٍ. فقال رَسول اللة صلى اللة تعالى عليهِ وسلم أكُلُ تمرِ خَيبرَ هكذا. فقال لا واللّهِ يارسول اللة إنّا لنأخُذ الصّاعَ مِنْ هذا بالصّاعيْن والصّاعينِ بالثلاثة فقال رسول اللة صلى اللّهُ تعالى عَليهِ وسلم لاتفعَلْ بِع الجَمْعَ بالدّراهِم. ثُمَ أبتَع بالدراهم جنيباً.

## تەرجەمە

٥٨٥ دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی خودری وە أبو- هورەیرە (خ. ل) پێغەمبەر (د) سەواری کوڕی غەزیەی بەوەزیفە تەعین کرد لەسەر خەیبەر. هەندێ خورما لەنەوعێکی باش کەپێ یان دەگوت (جونەیب). بۆ پێغەمبەری هێنا پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەرێ خورمای خەیبەر هەمووی وەکو ئەمەیە. سەوار گوتی ناوالله ئەی پێغەمبەری خودا. ئێمە صاعێك دەکڕین بەسێ صاع لەخورمای تر ( واتە بەز یدەکی نەبێ نایدەن). پێغەمبەر (د) فەرمووی وامەکە خورمای هەڕەمەو خراپەکەی خۆت بفرۆشە بەپارە پاشان بەپارەکەی خورمای جونەیب بکڕە هەتا ببێتە دوو عەقد ومعاملە. ڕیبای تێکەل نەبێ.

(ش) ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خودای لێ بی بەمە أستدلالی کردووە. لەسەر جەوازی حیلە لەتەملیکی ڕەبەوی. بەجنسی خۆی و بەتەفاضول(واتە زێدەکی) بۆ وێنە وەکوو زێر بە زێر زێدەکی بەم تەرزە یەکێك زێرێك بدا بەزیو: یاخۆ بەکوتاڵ پاشان بەزیوەکە یابەکوتاڵەکە دووزێری لێ وەربگری ئەمە لەڕاستیدا یەك زێری فرۆشت بە دوو زێڕ بەڵام چونکی بووە دوو عەقد. دەخلی بەریبا نەما ظاهری شەرع بووە زێڕ بە زیو لەعەقدی پێشوو لەعەقدی پاشووش بووە زیو بە زێڕ لەنەقدو لەحواردنیش. ئەگەر جنسیان یەك نەبێ تەماثول واتە بەیەك

چوون شەرت نی یە بەتەفاضولیش بێ قەي ناكا. یاخۆ كرِیار وفرۆشیار لەژێر بە زیو مەئەلەن. بەقەرز بدەنە یەكتری پاشان هەردوویان گەردەنی یەكتر ئازا بكەن. یاخۆ بەهیبە بدەنەیەكتری. ئەم تەرزە بەیع وقەردە و هبەیە لای ئیمامی شافعی و حەنەفی دروستە بەشەرتی نەگۆتن بەدانی زێدەكی لەم عەقدانە ئەگەرنا حەرامە. وە ئەگەر لەناو دلی خۆیان خەیالی زێدەكی هەبێ مەكروهە. بەلاّم لای ئیمامی مالك ئەو كاتە بە تەفاضول جائزە. كەهەردوو عەقد لەیەك مەجلیس نەبێ بەم تەرزە ئەو مە جلیسی كەخورما خراپەكەی لێ بەپارە دەدا غەیری ئەو مەجلیسە بێ. كەپارەی لێ بە خورمای باش دەدا.
إستدلالیشیان كردوە ئیمامي شافعی وئیمامی حەنەفی لەسەر ئەوەی كەدروستە فرۆشتنی خواردەمەنی بەخواردەمەنی لە پێش لێك جودا بوونەوە وە لە پاش لێك جودا بوونەوەش لای ئیمامی مالك قەدەغەیە لەپاش لێك جودا بوونەوە.(شەرقاوی( ج ٢)) ص١٩٣.

٥٨٦ عَن عائِشةُ(ض) خذي أنتِ وبنوكِ مايكْفيكِ بِالمعروفِ.

## تەرجەمە

٥٨٦ دەگێرنەوە لەحەزرەتی عائشە (ڕەزای خودای لێ بی). گوتی هیندی دایكی معاویە بەپێغەمبەری گوت. گوتی ئەبو سوفیانی مێردەكەم پیاوێكی ڕەزیل و حەریصە. ئایا گوناهم دەگاتێ ئەگەر بەدزی لەمالی ئەو سەرف بكەم. پێغەمبەر فەرمووی هەندی كفایەتی خۆت ومنالت صەرف بكە بەعادەت. (ش): ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (د) فەتوا بووە حوكم نەبووە چونكی ئەبو سوفیان لە مەكە بووە كەوابێ بەم حەدیثە. أستدلال ناكرێ لەسەر جەوازی حوكم لەسەر غائب. بەلاّم سوهەیلی گوتیتی ئەبوو سوفیان حازر بووە. وە بە هیندیشی گوتووە گەردەنت ئازاد بێ لەهەرچی بردووتە لەمالی من ئنجا ئەگەر حوكمیش بێ حوكم لەسەر حازر بووە چونكی موحاكەمە و دادگا هەردوولای دەعوا مدعی ومدعی علیە (داوا كار و داوالێ كراو) دەبێ ئامادەبن.

٥٨٧ عَنْ ابي هريرة (ض) هاجَرَ أبراهيم عَلَيْهِ السلام بسارةَ فدخَلَ بها قريةً فيها مَلِكٌ من الملوكِ. وجبّارٌ منَ الجَبابِرَة. فقيلَ دَخَلَ أبراهيمُ بأمراةٍ هي من أحسَنِ النساء. فأرسلَ إليه. آن ياأبراهيم مَنْ هذه التى مَعَكَ قالَ أختي ثم رَجَعَ اليها فقال

لاتُكذّبي حديثي. فاني أخبرتُهُم أنكِ أختي. واللّٰهِ إنْ على الارضِ موءمِنٌ غيري وغيرُكِ. فأرسَلَ بها إليه. فقام اليها فقامت تَوَضّاءُ. ( بحذف أحدى التائين أصلهُ تتوضّاءُ). وَتصلي. فقالت اللهمَّ ان كنتُ آمنتُ بِكَ وبرسولِكَ وأحصنتُ فرجي الآ على زوجي. فلا تسلط عليّ الكافرَ فغُطَّ حتى رَكَضَ بِرِجْلِه. قالت اللهم إن يَمُتْ يُقالُ هي قتَلتهُ. فأرسِلَ ثم قامَ اليهَا تَوضاءُ وتُصلي وتقول اللهمَ إن كنتُ آمنتُ بِكَ وبرسولِكَ واحصنتُ فرجي الآ على زوجي فلا تُسَلطُ عليَّ هذا الكافرَ فغُطَّ حتى رَكَضَ بِرجله فقالتْ اللهُمَ ان يَمُتْ فيقالُ هيَ قَتلتْهُ فأرسِلَ في الثانيةِ أو في الثالثة. فقالَ واللّهِ ماأرسلتُم اليَّ الآ شَيطاناً. أرجعُوها الى ابراهيمَ عَلَيْهِ السلامَ وأعطُوها آجَرَ فرَجَعَت الى أبراهيم عليهِ السلام فقالَت أشعَرْتَ أن اللّهَ. كبَتَ الكافِرَ وأخدَمَ وَليدَةً.

## تەرجەمە

٥٨٧ دەگێرنەوە لەئەبو هورمیرە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی أبراهیم پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بی. بەسارە خاتوونی خێزانی یەوە باری کرد لەووڵاتێك بۆ ووڵاتێکی تر. ئنجا چووە گوندێك (بیژراوە مصر بووە) (أبنی قتیبە گوتیتی ئەردەن بووە) لەو گوندەش پاشایەك هەبووە لەپاشایان یاخۆ فەرمووی زاڵمێکی بەهێز هەبوو لەزاڵمان. خەبەر بەپاشایەکەدرا کەأبراهیم داخلی شاربوو. ژنێکیشی لەگەڵدایە لەجوانترین ژنی ڕووی عاردە. ئنجا پاشا ناردیەشوێن أبراهیم. گوتی ئەی أبراهیم ئەم ژنە کێ یە لەگەڵتدایە گوتی خوشکمە (یەعنی لەدین). پاشان بۆ تەوصیە أبراهیم بۆلای سارە چووە. گوتی ئەی سارە قسەم بەدرۆ مەخەوە چونکی من بەوانم گوتووە تۆ خوشکی منی (سەبەبی ئەم تەوصیەی أبراهیمیش ئەوەبووە. پاشایەکە دینی وابوو هەرژنێکی مێردی هەبوایە مێردەکەی دەکوشت. یابەزۆر پێ ی تەلاق دەدا. ژنەکەشی داگیردەکرد. ئەگەر مێردیشی نەبوایەکەسی نەدەکوشت. لەئەنجام ژنەکەی دەبرد کوشتنیش گەورەترە لەداگیرکردنی ژن بەشەرع. ئنجا بەکردنی کارێکی سووك کارێکی گەورەتری دەفع کرد. سوێند بەخودا لەسەر عاردی. ئەم ووڵاتەی کەتیاین هیچ ئیمانداریك نی یە من وتۆ نەبێ. پاشان أبراهیم سارەی بۆ نارد. وەکوو گەیشتە لای پاشا.

بۆلای ساره هەلستا. ساره خاتوونیش هەلستا بۆ دەست نوێژ وە نوێژی کرد. گوتی ئەی خودایا ئەگەر من باوەڕم بەتۆ هێناوە وە بە پێغەمبەری تۆ هەیە کە أبراهیم پێغەمبەرە سەلامی خوای لێ بی. وەناموسی خۆشم پاراستووە. لەسەر مێردی خۆم نەبێ. ئەم کافرەم لەسەر موسەلەط مەکە. جێ بە جێ کافر پشێ گیرا کەوتە سەر عارد. قاچەکانی لەعارد وەدەژەنی. سارا ترسا بمری.گوتی ئەی خودای من ئەگەر ئەو کافرە بمری دەلێن ئەو ژنە کوشتی. پاشا هەڵستاوە بۆلای ساره خاتون بچی. سارا خاتونیش هەلستا دەست نوێژ بشوا وە نوێژی کرد گوتی ئەی خودایە ئەگەر باوەڕم بەتۆ هێناوە وایمانم بە أبراهیم هێناوە کەپێغەمبەری تۆیە. وە پارێزگاری ناموسی خۆشم کردووە لە مێردی خۆم نەبێ. ئەم کافرەم لەسەر موسەلەط مەکە جێ بە جێ پاشا پشی گیرا کەوتە سەر عارد قاچەکانی لەعاردەوە دەژەنی سارا ترسابمری گوتی ئەی خودایا ئەگەر ئەم کافرە بمری دەلێن ئەم کوشتی پاشا هەلستاوە گوتی والله شەیتان نەبی بۆمن نەنار دراوە بی بەنەوە لای ابراهیم هاجەریشی پێ بدەن. ( باوکی ئاجەر پاشایەك بوو لەپاشایانی قبط لە وولاتی مصر لە شاری حەقن دادەنیشت ). ئنجا گەڕاوە لای ابراهیم سەلامی خوای لێ بی. گوتی ئەری زانیت خودا ئەم کافرەی چۆن لەسەر ڕوو بەعارد دادا وە ئەم جار یە منالەشی پێ دام بۆخدمەت.

لەم حەدیثە وازاندرا وەرگرتنی هەدیە و دیاری کافران دروستە یەکێکی تریش درۆی بەتەئولیش دروستە ئەگەر لەراستیدا درۆ نەبێ. إستنباطیش کرا ( واتە وا زاندرا لەم حەدیثە ) کردنی أهون الشرّین بۆ نەهێشتنی اعظم الشرّین لەمەپێشیش مەثەلی ئەمە ڕەت بوو. یەعنی قسەی ابراهیم سەلامی خوای لێ بی ئەگەر بالفرض قبوولی تەئویلیشی نەکردبایە. کە گوتی خوشکی منە لەبەر دەفعی کوشتن کەلەوانەبووببی هەر دروست بوو. چونکی لەترسی کوژران کفریش جائزە. هەروەکو آیەت دەفرمووێ.(الامن أکرهَ وقلبه مطمئنّ بالایمان ) لەو کاتەی سارە لای پاشا بوو خودا پەردەی لەپێش چاوی أبراهیم لابرد لە جێگای خۆی. سارە وپاشای دەدیت بۆیە وەکوو هاتەوە لای ابراهیم گوتی. ئەرێ زانیت خودا ئەم کافرەی چلۆن لەسەر ڕوو بە عەرد دادا. بۆیە پەردە لەپێش چاوی ابراهیم هەلگیرا نەوەك فکرێك بەدلّی دابی دەرحەق بە سارا خاتوون (الطیبات للطّیبینَ والطیبون للطیبات ).

٥٨٨ عَنْ ابي هريرَة (ض) والذي نَفسي بِيَدِه ليوشِكَنَّ اَن يَنزِلَ فيكُمْ ابنُ مَريَم حَكَماً مُقسطاً فَيكسِرَ الصَّليبَ ويَقتُلَ الخِنزيرَ ويَضَعَ الجزيَةَ ويَفيضُ المالُ حتى لايَقبَلهُ أحَدٌ.

## تەرجەمە

٥٨٨ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە ( ڕەزای خودای لێ بی ) پێغەمبەر(د) فەرمووی سوێندم بەو زاتەی کە ڕوحی من لەدەستی ئەوە. بێ شکو وگومان نزیکە کوڕی مەریەم کە حەزرەتی عیسایە سەلامی خوای لێ بی لە ئاسمان بۆناو ئێوە بێتە خوارێ بەحاکمێکی زۆر عادل ئنجا صەلیب بشکێنی. وە حوکم بە إعدامی بەراز بکاو جزیەش دابنێ. ئەو کاتە ماڵ زور دەبی لەبەر زۆری خێرات وبەرەکات. هەتا وای لێ دێ یەکێك قبولی ماڵ ناکا. کلمەی(یضع الجزیة). لەمەعنایەکەی أختلاف هەیە جمهور دەلێ جزیەیان لەسەر لادەبا چونکی هەموویان دێنە سەر دینی ئیسلام. نوسەری ئەم دێرانە دەلێ لەم صورەتە ئەبێ عنهم ملحوظ بی چونکە وضعە کە متعدی بێ بەمەعنا تەرکە. کەبە علی مقیدبێ بەمەعنا دانانە. بۆیێ عیاض گوتیتی جزیە یان لەسەر لادەبا موسلمانیش نەبن ئەگەر بگۆترێ لەم قەولە لازم دێ عیسی سەلامی خوای لێ بی ناسخ بێ بۆ شەریعەتی إسلامیە کەجزیەی واجب کردووە لەجوابدا بەلێین. عیسا نابێتە ناسخ بەلکی پێغەمبەر (د) خۆی ناسخە بەم حەدیثە چونکی حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێ بی لەهەموحوکم و عەدالەتی خۆی لانادا لەشەریعەتی محمد یە (درودی خوای لەسەر بێ).

٥٨٩ عَنْ ابن عباس (ض) مَن صَوَّرَ صورةً فانَّ اللّهَ معذّ بُهُ حتّی یَنفُخَ فیها الروحَ ولیسَ بنافخ فیها.

## تەرجەمە

٥٨٩ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پیاوێك هاتە لای گوتی ئەی کوری عەباس. من پیاوێکم بە صنعەتی دەستی خۆم دەژیم. من وێنان نەقش دەکەم عبداللە فەرمووی ئاگادار بە من هیچ حەدیثێك ناخوێنمەوە ئەو قسەیە نەبێ لە پێغەمبەرم بیستبی بەخۆم گوێم لێ بوو دەی فەرموو هەر کەسێك وێنەی گیاندارێك نەقش بکا بەڕاستی خودا عەزابی دەدا هەتا روح دەخاتە بەربەدەنی وێنەکە خۆ قەت پێشی ناکرێ ڕوحی بخاتە بەربەدەنی صورەتەکە بەقەطعی (کەوایە بەئەبەدی عەزاب دەدرێ) (ش) ئەم حەدیثە مەحمولە وەسەر استحلالی رەسم کێشان ئەگەر نا کافر نەبێ هیچ کەس بەئەبەدی (هەتا هەتایە) لە عەزاب دا نابی. بەتایبەتی وێنەیەکی کەسێبەری نەبێ. وەکو ئەشکالی فوتوغرافیە لە بوخاری پیرۆز لەئاخری کتابی اللباس (الا رَقما في ثوبٍ).

کەلە حەدیثی ژمارە (٥٦٤) لەحەدیثی عائشە ڕەت بوو جائزە ودروستە(شیخ الاسلامی تورشیچی زادە- لەزەمانی سلطان عبد العزیز فەتوای پیّ دا.

٥٩٠ عن ابي هُرَيرَةَ قال اللهُ ثلاثةٌ أنا خَصْمُهُمْ يوْمَ القيامة رَجُلٌ أعطى بي ثُمّ غَدَرَ. وَرَجُلٌ باعَ حُرّاً فأكلَ ثَمَنَهُ. وَرَجُلٌ أستأجَرَ أجيراً فأستَوفى منهُ وَلمْ يُعطِهِ أجْرَهُ.

**تەرجەمە**

٥٩٠ دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە - ڕەزای خودای لیّ بی - پێغەمبەر فەرمووی خودای گەورە فەرموویتی. سیّ بەش لەخەلکی هەن من دوژمنی ئەوانەم ڕۆژی قیامەت (یەکەمیان) ئەو کەسەیە سوێند بەناوی من بخوا لەسەر وەعد وموعاهەدەی خوی لەگەل خەلك. پاشانیش بەپێچەوانە بجولیتەوە وهەلی وەشینتەوە (دووەم) پیاوێکە حورێك بفرۆشی ئنجا نرخەکەی بخوا. ئەمەش لەدوو مادە ڕوودەدا یەکی یان عەبدو بەندەی خۆی بووبیّ ئازادی کردبیّ لەپاش ئازاد کردن بەتۆبزی خدمەتی خۆی پیّ بکا گوناهی پێشوویان کەشاردنەوەیە یان إنکارە بەهێزترە.(سیّ یەم) پیاوێك یەکێکی بەکریّ گرتبیّ بۆ ئیشێك ئیشەکەی خۆی بەتەواوی پیّ کردبیّ کریّ یەکەشی نەدابیتی: باس کردنی سیّ لە حەدیث بۆ تەخصیص نی یە چونکی خودای گەورە دوژمنی هەموو زالمانە بەلاّم ویستیتی بەتوندی باسی ئەم سیّ کەسانە بکا.

٥٩١ عَن جابر ابن عبدالله (ض) ان اللة ورَسولهُ حرّمَ بيعِ الخمرِ والمَيتةِ والخنزيرِ والاصنام فَقيلَ رَسولَ اللّه. أرأيتَ شُحومَ الميتَةِ فأنّها يُطْلى بها السُفُنُ وَيُدْهَنُ بها الجُلودُ. وَيَستَصْبِحُ بها الناسُ فقالَ لا هوَ حرامٌ قاتَلَ اللّهُ اليهودَ إنَّ اللّهَ لَمّا حرّمَ شحومها جَمَلوهُ ثُمّ باعوهُ. فأكلوا ثمنَهُ.

**تەرجەمە**

٥٩١ دەگێرنەوە لەجابری کوڕی عبدالله ڕەزای خودای لیّ بی. گوتی پێغەمبەر (د) لەمەکە لەسالی فەتح فەرمووی. بەڕاستی خوداو وپێغەمبەری خودا حەرامیان کردووە فرۆشتنی شەرابو حەیوانی مردارو بەرازو بتوسەنەم. (ش) لەبەر بیّ کەلکیان هەرچی بیّ کەلکیش بیّ فروشتنی حەرامە. بەلاّم

ئەگەر سوود وەربگیرێ لە پارچەی بوتەكان بە شكاوی دروستە فرۆشتنیان لای ئیمامی شافعی ولای هەندێكیش لە حەنەفی پاشان پێ ی گوترا ئاگادارمان بكە لەپیوی(بەز) ی حەیوانی مردار كە كەشتی‌و قایەغی پێ چەور دەكرێو وە لە چەرمو پێستە دەدرێ بۆ ڕۆناكی لە چرا دەكرێ فەرمووی مەی فرۆشن فرۆشتنی حەرامە. بەلاَم كەڵكی لێ وەربگرن حەلاَڵە.

(ش) دروستە گواستنەوەی ڕوونی پیس باڕوونی سەگیش بی. بۆ خەلكی بەسەبەب وەصیەت بەلاَم بەهبەو صەدەقە قەدەغە كراوە لەلایەن قازی أبو الطیب. بەلاَم لەرەوضە گوتیتی لازمە صحەتی صەدەقە بەڕوونی پیس بۆ سووتاندن لەناو چراو شتی تریش موتەوەلیش جەزمی پێداهێناوە هەندێكیش لە زانایان گوتیتیان حەدیث كەدەلێ(هو حرام). بە مطلقی حەرامە یەعنی إنتفاعیشی (واتە كەلك لێ وەرگرتنیشی وەكو فرۆشتن و صەدەقە و هبە حرامە.

بەلاَم شتی پیس كراو واتە شتێك لەئەصلا پاك بێو پیس كرابێ فرۆشتنی دروستە چونكە جەوهەرەكەی پاكە پیس بوون عەرضیە (لاوەكیە) واتە لە لاڕایە. پێغەمبەر (د) فەرمووی لەعنەتی خودا لەجولەكەكان بێ خودا وەكوو پیوی لێ حەرام كردن بەموطلەقی یەعنی لەحەیوانی مردار وغەیری مردار. پیویان تاواندەوە پاشان دەیانفرۆشت وقیمەتەكەیان دەخوارد.

(ش) كە حەرامیشە فرۆشتنی شەراب ومرداروو بەرازو ئەصنام یاخۆكرینی شتێك بەمانە پیستەی مردار نەبێ لەغەیری سەگو بەراز. لەپاش دەباغ دروستە. فرۆشتنی‌و كەلك لێ وەرگرتنیشی پێ بكرێ. وە بەزی ناو زگی ودونگی مرداریش نەبێ. لەپاش ئەمە كەكران بە سابوون چونكی پاك دەبنەوە بەسەبەب انقلابی حەقیقەت وەكوو پاك بوونەوەی ئارەق پاش ئەوەی كە بووە سركە. دروستە فرۆشتنی‌و كەلك لێ وەرگرتنی ئەوانیش. بەمەزهەبی شافعی هەر وەكوو فرۆشتنی شەراب حەرامە فرۆشتنی مێوژیش حەرامە بیدەیە خەمارو خاوەنی مەیخانە. بەلاَم بەمەزهەبی حەنەفی مێوژ فرۆشتن حەرام نیـیە بۆیی هەندێ لەوانەی مەزهەبیان شافعی‌یە بەتەقلیدی حەنەفی مێوژی خۆیان دەفرۆشنە مەی دروست كەرو مەیخانەكان ئەگەر كەسێك ڕشت بێ لەسەر دین شتی وا ناكا. یەكێكی تریش رەسمو صورەتێكی كەلە زێڕو مجوهراتی بەنرخ

دروست کرابیٚ لای قەولیٚکی ئیمامی شافعی رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ دروستە کرینیان چونکی ئەصلی مەقصەد رەسمو صورەت نی‌یە. بەلکی مەبەست زیٚرو جەوهەرەکەیە.

## باسی سەلەم

## كتاب السلم

٥٩٢ عَنْ إبنِ عباس (ض) مَن أسلفَ في شيءٍ ففي كَيْلٍ معلومٍ وَوَزنٍ مَعْلومٍ الى أجَلٍ مَعْلومٍ.في رِوايَةٍ فليُسلِفْ في كَيْلٍ مَعْلومٍ الى أجَلٍ مَعْلومٍ.

### تەرجەمە

٥٩٢ دەگیٚرنەوە لەعبدالله کوڕی عەباس ڕەزای خودای لیٚ بی. گوتی پیٚغەمبەر (د) وەکوو تەشریفی فەرمووە مەدینە. ئەهالی پیٚشین پارەیان بەسەر میٚوەجات دەدا. بەماوەی سالیٚک. بەماوەی دوو سالٚ ئنجا پیٚغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسیٚک پیٚشین سەرمایە بەسەر شتیٚک بدا لەمیٚوەجات. بالە پیوانیٚکی دیار وەلە کیٚشانیٚکی دیار بەسەر بدا. لەریوایەتیٚکی تریش فەرموویتی. بالە پیٚوانیٚکی دیار هەتا ماوەیەکی دیار بەسەر بدا، (ش) یەکیٚك لەمەرجەکانی صحەتی سەلەم دەبی پارەی سەرمایە (رأس المال) لەمەجلیس عەقد تەسلیم بکریٚ. ئەگەر ئەو دوو کەسەی سەلەم دەکەن لەپیٚش ئەوەی پارەکە تەسلیم بکەن لەیەك جودا بوونەوە ئەم سەلەمە فەسخ دەبی واتە بەتالٚ دەبی. لەمەزهەبی حەنەفی ومالکی وایە.لەمەزهەبی حەنەفی لای ڕاست ترین قسەلای کەمی دەبی ئەو مالەی سەلەمی لەسەر دەکریٚ هەتا مانگیٚك دوا بخریٚ(موجەل بی) لای ئیمامی مالك دەبیٚ لای کەمی پازدە ڕۆژ موجەل بی. لای ئیمامی شافعی بەقەطعی شەرت نی یە موجەل بی نرخ وفرۆشیار هەر کامیٚکی زووتر بدریٚ یاخۆ هەردوویان دوابخریٚن سەلەم ڕاستە بەلام ئەگەر بەموجەلی کرا وەقت وزەمان لازمە. شافعی لەکلمەی شیء لەحەدیث وای أستنباط کردووە سەلەم لەحەیوانیش دروستە چونکی شیء واتەشت بەربلاو ترە. لای حەنەفی عەقدی سەلەم لەحەیوان دروست نی یە.

# « كتاب الشفعَه »

# « باسی شوفعه »

٥٩٣ عَنْ ابي رافع(ض). الجارُ أحقُّ بِسَقَبِهِ.

## تەرجەمە

٥٩٣ دەگێرنەوە لەئەبو رافع - ڕەزای خودای لێ بی - کەلەپێشدان عەبدی حەزرەتی عەباس بوو پێشکەشی پێغەمبەر کرد (هبه). پاشان وەکوو خەبەری موسلمان بوونی عەباسی دا بەپێغەمبەر (د) ئەویش ئازادی کرد. ناوی ئەسلەم بوو قبطی بوو ڕەزای خودای لێ بی هاتەلای سەعدی کوڕی وەقاص گوتی ئەم دوو مۆدە خانووەی کەلەناو دائرە خانوەکانی تۆ دایە لێم بکرە. سەعد گوتی والله لە چوار هەزار درهەمت زیاتر نادەمێ بە تەقسیط ئەبو رافع گوتی بەم دوو خانوە پێنج سەد دیناریان داومێ. ئەگەر لەپێغەمبەرم نەبیستبایە، دەی فەرموو جیران أستحقاقی زیاترە لە غەیری جیران. بەسەبەب نزیکی وخانوو پێکەوە نووسان. بە چوار هەزار درهەمم پێ نەدەدای. من پێنج سەد دینارم پێ درا. ئنجا خانووەکانی دا سەعد. (سەقب. بەواتەی نزیکی و خانوو بەیەکەوە نووسان).

(ش) ئیمامی ئەعزەم بەلگەی ئەم حەدیثەی ئەبوو رافعە لەسەر شوفعەی بەجیرانەتی غەیری ئەویش وایان لێك داوەتەوە. جیران ئەگەر شریك بێ مافی زیاترە بۆکرین. یاخۆ أستحقاقی زیاترە بۆ چاکە لەگەل کردن ویاریدە دان. لای ئیمامی شافعیش بۆجیرانی کەخانووەکەیان بەیەکەوە نووسابێ بەقەطعی حەقی شوفعەی نی یە. بەدەلیلی حەدیثی جابر کەڕەت بوو. چونکی پێغەمبەر(د) لەوێ حوکمی بەشوفعە کرد لە ملکێك قبولی تەقسیم نەکا لە بەینی شریکان بەلام ئەگەر تەقسیم ببی بە دانانی سنوور لە بەینیا. حەقی شوفعەی نی یە کەوایە حەدیثی ئەبورافع حەملیش بکرێتە سەر لێکدانەوەی یەکەم کەشریك بوونە شرکەتەکەیان لەبەر جیرانەتی بووە چونکی دوو خانوەکانی ئەبو رافع مەعلومو دیار بوونە. لەناو دائرە خانوەکانی سەعد نەکونجان لەبەینی حەدیثی جابرو ئەبو رافع هەرهەیە. بۆیێ خطابی کوتیتی. حەدیثی ئەبو رافع إسنادەکەی تەواو نی یە ئەو حەدیثانەی کەوارد بووینە دەرحەق. بە صحەتی شوفعە. لو

مولكی ماوبەش كەدا بەش نەكرابێ. إسنادەكانی یان باش بەهێزن. پێش خراوون لەسەر إسنادی حەدیثی ئەبو رافع. بەلام ئیمامی ئەعزەم كەبەم حەدیثەی ئەبو رافع حوكمی كردووە. بەصحەتی شوفعەی بەجیرانەتی وشفعەی لە مولكی ماوبەش. سێ داواش هەیە كەلازمە هەبێ بۆئەوەی شوفعە دروست بێ.
یەكی یان: داوای مواثەبە دووەم: داوای تقریر وإشهاد سێ یەم: داوای خصومەت وتەملوك.
ئنجا بۆ داوای یەكەم كەمواثەبەیە لە مەجلیسی عەقد جێ بە جێ بلێ من شەفیعی ئەم فرۆشراوەم. حەقی خۆم داوا دەكەم دووەم: بچێتە لای ملكەكە و عەقارەكە. لای كەمی لای دوو شاهید بلێ ئێوە شاهید بن بۆ ئەو ملكو عەقارە من شەفیعم. بەبێ خەبەری من بفرۆشرێ. من دەعواچی موشتەریم. لەوەقتی فرۆشتنیشی لەمەجلیسی عەقد داوای شوفعەم كردووە. ئێستاش لەئێوەش داوا دەكەم . شاهید بن: یاخۆ ئەم قسانە بالذات بە كریار بلێ. یاكاغەزی بۆ بنووسی ئەگەر لەجێكاییكی دوور بوو. وە بۆ داوای سێ یەم شەفیع لازمە لە پێش حاكم داوای دەعوای خۆی بكا. ئەگەر یەكێك لەم سێ یانە خەلەلی پێ بكا حەقی شوفعەی ساقطە (واتە مافی شوفعەی نی یە). ئنجا دەبێ لەم سێ داوایە زۆر دیقەت بكا.

# « كتاب الاجاره»
# « باسی كرێ»

٥٩٤ عَنْ أبي موسى (ض) لَنْ أولا نَسْتَعْمِلُ على عملنا مَنْ أرادهُ.

## تەرجەمە

٥٩٤ دەگێرنەوە لەئەبو موساى ئەشعەری (رەزای خودای لێ بی). هاتم بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) دوو پیاویشم لە ئەشعریان لە كەلدابوو. وەكوو گەیشتینە خدمەت پێغەمبەر (د) لەسەر وەزیفەیەك وكار فرمانێك دایان بنێ. پێغەمبەریش بەتوورەیی ئاورێكی لەمن دایەوە. فەرمووی ئەی ئەبو موسی یا فەرمووی ئەی عبدالله كوری قەیس. كەزانیم دلی بیروزی عاجز بوو. گوتم ئەی پێغەمبەری خودا بەحەقی ئەو زاتەی تۆی ناردووە بە

پێغەمبەرایەتی نەم زانیوە ئەم دوو پیاوە فکری توظیفیان هەبووە قسەیان لەلای من نەکردووە. پاشان پێغەمبەر ڕاستە و ڕاست بەدوو پیاوەکەی گوت. ئیمە لەسەر ئیش وکاری خۆمانی دانانێین ئەو کەسی داوای وەزیفەو کار وفەرمان بکا.
(ش): چونکی داوا کردنی بۆ کار وفەرمان وادەگەینی کەزۆر پەرۆش بێ بۆی. ئەمەشیان توهمەتەو ئەنگی یە. ئیمامی بوخاری ڕەحمەتی خودای لێ بی. لەباسی کرێ باسی کردووە. چونکی فەرمانبەری میری عادمتەن بەکرێ گیراوێکی حکومەتە. یەکێکی تریش موافقەی مەسەلەکی مشهور و بەر بلاوە کەدەلّی. ئیش بۆ پیاو مەبینەوە بۆ ئیش پیاو ببینەوە. لەگەل حەدیثی پیرۆز ئنجا چەبۆ پایەیەکی دادی بێ(قضاء) یابۆ فەرمانەکانی تر بێ. ئەهلو ئەربابی إستحقاق تەعین بکرێ پێویستە.
لەم حەدیثە پیرۆزە وازاندرا هەروەکوو داوای کار کردن لەکاروباری (داد)(منصب قضائي) شتێکی ناپەسندە بە شەرع داواکردنی کارو فەرمانەکانی تریش هەر ناپەسندن ومذمومن.

٥٩٥ عَن أبي هُريرةَ (ض) مابَعَثَ اللّهُ نَبياً الآ رَعى الغَنَمَ فقالَ أصحابُهُ وَأنت فقالَ نَعَم كُنتُ أرعاها قَراريطَ لاهلِ مكّة.

## تەرجەمە

٥٩٥ دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی. خودای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەنارد مەگەر لەپێش پێغەمبەرایەتی شوانی مەر بووە. یارە کانی پێغەمبەر پێ یان گوت تۆیش فەرمووی بەلّێ: من مەرم دەلەوەڕاند بۆ خەلّکی مەکە هەریەك سەر بەیەك قیراط کەدەکا نیو درهەم . چونکی قیراط یەك بەشە لەبیستو چوار بەشی دینار: دیناری ئەو کاتەیش دوازدە درهەم بووە. حیکمەتی لەوەڕاندنی حەیوانات. بۆ پێغەمبەران درووودی خوایان لەسەر بێ. هەتا فێری ئارام گرتن بن. بۆپەروەردە کردنی ئومەتەکانیان لەخواپەرستی وپاراستنیان بەسەبەب صەبرگرتن. لەسەر پاراستنی حەیوانات لەدرەندە و لەچەنگ دز وەلەسەر بەخێو کردنیان لەم لەوەرگامە بۆ لەوەرگامێکی تری خۆشتر چونکی بێ هۆش وسەروزمانن. وەکوو ئومەتە نەزان و جاهیلەکانیان. وەهەتا تەخەلوقیش بکەن بەئەخلاقی باشی بەزەیی پیاهاتنەوە وسنگ

فرەوانی وەسەرفی نەزەرو لیّ بوردن لە خەراپەکان ئومەتەکانی کەللە ڕەقیان. لەبەر نەزانینی پەرژەوەندی یان. وەکوو بەزەیی پیا هاتنەوەو پشی فرەوانی شوانان دەرحەق بەبەستە زمانانی ئاژەلی سروشت هەمە جۆر (مختلف الطبایع) ونەزان. ئنجا حەیوان لەوەڕاندنی پیّغەمبەران سەلامی خوایان لیّ بی چونکی بۆ بەدەست هیّنانی میهرەبانی و بەزەیی وسیاسەت وزیرەکی وپشی فەرەوانی و خۆبەگەورە نەزانین بووە. نەبووەکەمی یەك بۆ گەورەیی پایەی پیّغەمبەران سەلامی خوایان لیّ بی. چونکی بوو بە بنچینەیەك بۆ ڕەووشتی پیرۆز و بەرزی یان.

٥٩٦ عن أبي موسى(ض) عن النبيّ (صلى اللة تعالى علية وسلم) قالَ مثلُ المسلمينَ واليهودِ والنصارى كمثلِ رَجُلٍ إستأجَرَ قوماً يَعمَلونَ لهُ عَمَلا يَوماً الى الليلِ. على أجْرٍ معلوم فعملوا لهُ الى نِصفِ النهارِ. فقالوا لاحاجةُ لنا الى أجرِكَ الذي شرطْتَ لنا وما عَملنا باطلٌ. فقال لهُم لاتفعَلوا أكملوا بقيّةَ عملكُم وَخُذوا أجرَكُم كاملاً. فأبوا وتركوا وأستأجَرَ آخرينَ بعدَهُم. فقالَ أكملوا بقيّةَ يَوْمكُمْ هذا ولكم الذي شَرطْتُ لهُم من الاجرِ فعَمِلوا حتى أذا كانَ حينَ صلاة العصرِ قالوا لكَ ماعَمِلْنا باطلٌ ولكَ الاجرُ الذي جعلتَ لنا فيه فقالَ اكملوا بَقيةَ عملكمْ فأنّما بقيَ مِنَ النهارِ شيءٌ يسيرٌ فأبوا فأستأجَرَ قوما أن يَعملوا له بقية يومهم فعَملوابقية يومهم حتّى غابَت الشمسُ فأستكملوا أجرَ الفريقينِ كِليهِما فذلكَ مَثَلُهُم ومَثَلُ ما قبِلوا من هذا النّورِ.

**تەرجەمە**

٥٩٦ دەگێرنەوە لەئەبو موسای ئەشعەری ڕەزای خودای لیّ بی. پیّغەمبەر (د) فەرمووی ویّنەی ئۆمەتی أسلام لەگەل پیّغەمبەری خۆیان. وە مثالی جوولەکەو دیانان لەگەل پیّغەمبەرە کانیان وە کوو پیاویّکە بەکریّی گرتبی قەومیّك کەجولەکەکانن ئیشیّکی بۆ بکەن لەسبەینە تا ڕۆژ ئاوا بەحەقیّکی دیاری کراو کەپیّنج درهەم بی مەثەلەن. پاشان هەتا نیوەڕۆ ئیشی بۆ بکەن. ئنجا بلّیّن هیچ پیّویستمان بە پیّنج درهەمەکانی تۆنی یە

کەحەقێکە بۆ ئێمەت دیار کردووە. ئەمە ئیشارەیە وەباڵ ڕوو وەرگێرانی جوولەکەکان لە ئیمان بەهاتنی عیسی سەلامی خوای لێ بی. وەئەو ئیشی کردووشمانە لەسبەینی تانیوەرۆ بابێ حەقوکرێ بێ. (ئەمەش إشارە یە وەبال. نەچوونە سەری کاریان لەبەر کفریان بەعیسی سەلامی خودای لێ بی. چونکی ئەنیا باوەر هێنانیان بەموسی لەپاش هاتنی عیسا کەلکی یان بۆنادا.

پیاوەکەش پێ یان بلێ وامەکەن کارەکەتان بەخۆرایی بروا. إستحقاقی کرێ یەکەتان مەدۆرێنن. ئیشەکەی خۆتان هەتا رۆژ ئاوا بکەن وە تەواوی حەقی خۆتان وەربکرن ئنجا ئەوانیش نەی کەن و کارەکە بەجێ بێلن. وەلە نیوەرۆوە قەومێکی تر بەکرێ بکرێ لەپاش ئەوان. ئنجا پێ یان بلێ وەرن ئیشم بۆ بکەن لەئێستاوە کەپاش نیوەرۆیە هەتا رۆژ ئاوا کرێ ی تەواوی رۆژتان پێ دەدەم یەعنی کرێ ی قەومەکەی پێشووش بۆ ئێوە بێ ئەوانیش ئیشی بۆ بکەن هەتا کاتی عەصر. ئەوانیش بلێن کرێ ی ئەو ئیشی کرد وومانە بۆخۆت بی کارەکەشیان بەخۆرایی بێ. پیاوەکەیش پێ یان بلێ ئیشەکەی خۆتان تەواو بکەن کەمێك ماوە رۆژئاوابی حەقی خۆتان تەواو وەربکرن ئنجا ئەوانیش نەی کەن واز لەئیشەکە بێنن. (ئەمە ئیشارەیە وەبال إمتناعی دیانان لەدینی إسلام بەهاتنی محمد (د). پاشان پیاوەکە قەومێکی تر بەکرێ بگرێ لەعەسرەوە هەتا رۆژ ئاوایی ئیشی بۆ بکەن بەکرێ ی حەقی تەواوی رۆژ. یەعنی کرێ ی دووفیرقەکانی تریش بۆ ئەوان بی. ئنجا ئەمە تەشبیهێکە بۆ ئەتباعی (محمد) وە بۆ قبولکردنی نۆرەیان کەدینی أسلامە لەسەر پێچەوانەی جوولەکەودیان(ش) لەم حەدیثە وا فەهم دەکرێ یەکێك بەکرێ بگرێ بۆ ئیشێکی کاتی (موەقەت). بەکاتێکی دیاری کراو لەپاشان بەبێ عوزر واز لە ئیشەکە بێنی. هیچ حەقی ناکەوی کارەکەی بەخۆرایی دەروا. بەلام لە حەدیثی سالم کوری عبدالله کوری حەزرەتی عومەر رەزای خودایان لێ بی کەلەبابی (مَن أدرك رَكْعَةً مِنَ العَصْرِ). رەت بوو کەدەلێ جوولەکە لە إستحقاقی کاری خۆیان هەتا نیوەرۆ قیراطیکیان وەرگرت. وەدیانیش لەنیوەرۆ هەتا عەصر قیراطیکیان وەرگرت. لەبەر عاجزبوونیان لەئیشەکە بەبێ أختیاری خۆیان چونکی مردن بەلام ئەوانەی کەلەژیاندا بوون لەپاش ناردنی عیسی ومحمد(ئیمانیشیان پێ نەمینان هیچ حەقیان ناکەوی وەکوو لەم حەدیثەی ئەبو موسی رون کراوە. بەلام لەم حەدیثەی ئەبو موسی بەهەوەسی

خۆیان ئیشەکەیان نەکرد چونکی ئەم دوو حەدیثە ئەوی دیار بێ بێک چوونکی یان هەیە دوو قەضیەیە (بابەتە) لەم حەدیثە مودەی دەوامی ئومەتی موساوعیسی ومحمدیە. إستنباط کراوە بەلام چونکی موداخەلەی نەبوو لەگەل حوکمێکی شەرعی نەمنووسی هەرکەسی دەیەوێ بزانی لەشەرقاوی. لەجلدی دووەم لەلاپەرە(٢٠٢) تەما شا بکا.

٥٩٧ عَن عبداللة أبنِ عُمَر. رضي الله تعالى عَنهُما قالَ سمعتُ رَسولَ الله صلى الله تعالى عليه وَسلم. يقولُ إنطلقَ ثلثةُ رَهطٍ مِمَنْ كان قبلكُمْ حتى آوَوْ المبيتَ الى غارٍ فدخلوهُ. فأنحُدَرَتْ صَخْرَةٌ مِنَ الجَبَلِ فسدَّت عليهم الغارَ. فقالوا أنَه لايُنجيكم مِنَ هذه الصَّخرة الآ انْ تدعوا الله بصالِح أعمالكم. فقالَ رَجُلٌ منهُم اللهمَ كانَ لي أبَوانِ شيخانِ كَبيران وكنتُ لاأغبِقُ قبلهُما أهلاً وَلا مالاً فنَأى في طلبِ شيءٍ يوماً. فلم أرِحْ عليهِمْا حتىّ ناما فحَلبْتُ لهُما غَبوقهما. فوَجَدتهما نائمين - فكرَهتُ أن أغبِقَ قبلهُما أهلاً أو مالاً فلبثتُ والقَدَحُ على يَدىَّ أنتظِرُ أستيقاظهما حتى بَرَق الفُجرُ فإستيقظا فشرِبا غَبوقهما. اللهُم إن كنتُ فعَلتُ ذلكَ أبتغاءَ وَجهِكَ. ففرِّجْ عنا مانحنُ فيهِ من هذه الصَخْرةِ فأنفرَجَتْ شيئاً لايستطيعونَ الخُروجَ. وقال الآخرْ اللهمَّ كانتْ لى بِنتُ عمّ كانتْ أحبَّ النساءِ اليَّ. فاردتُها عن نفسِها فأمتنَعَتْ منّى حتى ألمّت بِها سنةٌ من السنينَ فجاءَتنى فأعطَيتُها عشرين وَمائةَ دينار. على أنْ تخلي بيني وَبيْنَ نفْسها ففَعَلتْ حتى إذا قدرتُ عَليها لاأحِلُ لكَ أنْ تفُضَ الخاتمَ. إلاّ بحَقِّهِ فتحَرَّجْتُ منَ الوقوعِ عَليها. فأنصرَفْتُ عَنها وهيَ أحَبّ الناسِ اليّ وَترَكْتُ الذهَبَ الذي أعطيتُها اللهمَ إن كنتُ فعَلتُ ذلكَ إبتغاءَ وَجهكَ فافرِجْ عنّا مانحنُ فيهِ مِنْ هذه الصَّخرَةِ فأنفرَجَتَ الصخرةُ. غيرَ أنهم لايَستَطيعونَ الخروجَ منها. وقال الثالث اللهُمّ أستأجرتُ أجراءَ فأعطيتُهُم أجرَهُم غَيرَ رجُلٍ واحدٍ ترَكَ الذي لهُ وَذهَبَ فثمَرتُ أجرَهُ - حتى كَثُرَتْ منة الاموالُ فجاءَني بَعدَ حينٍ. فقالَ

ياعَبدَ الله أدّ اليَّ أجري. فقُلتُ لهُ كلُ ما ترى من أجرِكَ مِنَ الابلِ والبقَرِ والغَنَمِ والرَقيق. فقالَ يا عبد الله لاتستَهزئ بي فقُلتُ أني لاأستَهزىء بكَ فأخَذهُ كلّهُ فأستاقهُ فلمْ يترُكْ مِنْهُ شيئاً. اللهُمَّ فان كُنتُ فعَلتُ ذلكَ ابتغاءَ وجهكَ فأفرُجْ عنا مانحنُ فيه فأنفَرَجتْ الصَخرةُ فخَرَجوا يَمشونَ.

## تەرجەمە

٥٩٧ دەگێرنەوە لە عبداللەی کوڕی عمر ڕەزای خودای لێ بێ. پێغەمبەر (د) فەرمووی لەعالەمی پێش ئێوە سێ جەماعەت لەپیاوان لەریوایەتێکیش سێ پیاو بارانیان لێ باری چوونە ناو ئەشکەوتێك. بەردێکی گەورە لەچیاکە هاتە خوارێ دەرگەی ئەشکەوتەکەی بەتەواوی لێ گرتن بەیەکتریان گوت هیچ شتیك ئێوە نەجات نادا پاڕانەوە لەبەر خودا نەبێ بەکردەوەی باش‌و پاك کە کردبێتتان. ئنجا پیاوێك لەوان گوتی ئەی خودایا من باوکو دایکێکی پیرم هەبوو. لەبەشە شیری هێواران هیچ کەسم لەسەر ئەوان بەپێش نەدەخست لەکەس‌و عائلەی ماڵی خۆم. نە لەعەبدەکانم. پێشتر بەوانم دەدا پاشان ئێمە دەمان خواردەوە ڕۆژێك بۆ داواکردنی شتێك چووم پێم نەکرا زوو بگەڕێمەوە وەکوو هاتمەوە خەوتبوون. منیش شیرم بۆ دۆشین کە دیتم خەوتونە پێم ناخۆش بوو لەپێش ئەوان منداڵو عائلەو بەندەکانم بخۆنەوە. منیش بەکاسە شیرەکەوە ڕاوەستام چاوەڕێم دەکرد بەئاگا بێن هەتا کاتێك بەیانیدا ئەو کاتە بەخەبەر هاتن شیرەکەیان خواردەوە. ئەی خودایە ئەگەر من ئەم ئیشەم خالصا بۆ تۆ بوو نەجاتمان بدەی لەبەلای ئەم بەردە. بەردەکە نەختێك دەرگەکەی بەردا. هەندەی بەردا پێیان نەکرا بێنە دەرەوە. پیاوێکی تریش لەوان گوتی ئەی خودایە من کچە مامێکم هەبوو لەهەموو کەسێکم خۆشتر دەویست زۆر داوام دەکرد خۆم تەسلیم بکا هەر نەیدەکرد. هەتا ساڵێك گرانی‌و قاتی هات موحتاج‌و پەریشان بوو. هاتە لام منیش سەدو بیست دینارم پێ دا بەمەرجێك خۆم تەسلیم بکا گوتی باشە خۆی تەسلیم کردم ئیرادەم کرد جماعی لەگەڵ بکەم گوتی گەردەنت ئازا ناکەم بەناحەق مۆرم بشکێنی وە کون بکەی. (یەعنی هەتا بەنکاحی شەرعی مارەم نەکەی ئیزالەی بەکارمتم مەکە) (واتە مۆری کیژێنیم مەشکێنە). منیش خۆم پاراست لەم گوناهە نامەقە وازم لێهێنا.

کەلەهەموو کەسێکم خۆشتر دەویست. لەسەدو بیست دینارەکەش گەردنم ئازاد کرد. ئەی خودایە ئەگەر من ئەم کارەم تەنیا بۆڕازی بوونی تۆ کرد نەجاتمان بدەی لە گرتنی دەرگا بەم بەردە.
ئەویتر لە سێ پیاوەکان گوتی خودایە من چەند کەسێکم گرتبوو بەکرێ ئیشیان بۆ دەکردم حەقی هەموویانم‌دا پیاوێك نەبێ هەقەکەی خۆی جێ هێشتبوو. هەقەکەشی سێ صاع برنج بوو منیش برنجەکەم ساڵ بەساڵ دادەچاند. زۆر بوو بەڕادەیەکی وا چەند ڕەشەوڵاخو مەڕو ووشترم پێ کڕی. لەپاش چەند زەمانێك پیاوەکەی بەکرێ گیراو گوتی ئەی عەبدی خودا کرێی ڕۆژانەکەم بدێ. گوتم هەرچی دەیبینی لەمەڕو ووشترو ڕەشەولاخو بەندە کرێیەکەی تۆیە. بیانبە. گوتی ئەی بەندەی خودا گاڵتە بەمن مەکە. گوتم بەڕاستی من گاڵتە بەتۆ ناکەم پیاوەکەش هەمووی ئاژۆت لەم مەڕو ووشترو ڕەشەولاخو بەندەیە هیچی جی نەهێشت. ئەی خودایە ئەگەر ئەم کارەی من تەنیا بۆ ڕەزای تۆ بووە ئەم بەردە زلە دەرگەکە بەربدا نەجاتمان ببێ لەپاش دوعای پیاوی سێ یەم بەردەکە بەتەواوی دەرگەی بەردا. وە ڕۆیشتن
(ش) ئەم ئەشکەوتە ئەشکەوتی ڕەقیم بووە. لەسورەی کەهف باسی دەکا (أم حَسبتَ أنّ أصحابَ الكَهف والرَقيم). لەحەدیثدا نی‌یە دەلالەتێك لەسەر جەوازی عەمەل لەمالی بەکرێ گیراو بەبێ ئیزنی بەکرێ گیراو. ئێرە ئەمە ناگرتەوە چونکی بەکرێ گیراوەکە کرێ یەکەی وەرنەگرت بوو. کە ببیتە مالی ئەو. ئنجا ئەوەی بەکرێ ی گرتبی تەسەروفی تیدا کردبی. بەلکی خاوەن ماڵ(مستأجر) هەر تەصروفی لەمالی خۆی کردووە. بەکرێ گیراوەکەش (أجير) ڕۆژانەی خۆی هەیە بەس. بەڵام پیاوەکەی خاوەن ماڵ (مستأجر) حەزی کردووە چاکە یێکی لەگەڵ بکا ئەگەر نا زێدەکی کرێ یەکەی ناکەوی. وازاندرا کردەوەی باش چلۆن سەبەبی نەجاتە وەڕۆی ڕزگار بوونە لەڕۆژی قیامەت. سەبەبی نەجاتە لەدونیاش دیومە لەحەدیث. (يحصّلُ الدنيا بأعمال الآخرة).

٥٩٨ عَن أبي سَعيد الخدريّ(ض) وما يُدريكَ أنهّا رُقْيَةٌ قد اصبتُمْ أقسموا وأضرِبوا لي مَعَكُم سَهْماً فضَحِكَ(صلى اللة تعالى عليه وسلّمْ).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی خودری (ناوی سەعد بوو). گوتی جەماعەتێکی پێك هاتوو لەسێ کەس بۆغەزای قەومێك کەوتینە سەفەر. شەومان بەسەر داهات لای قەومێك دابەزین. داوامان لێ کردن میوانداریمان بکەن قبوولیان نەکرد. ئەو شەوە دووپشکێك بە سەرۆ کەکەیانی وەدا. ژان وئازار ئارامی لێ بری هەر چەند تەداویان کرد چارەی نەکرا. خۆبەخۆیی یان بەیەکتریان گوت عەجەبا دەبێ لەم مسافرانە دکتۆرێك نەبی هاتنەلای ئەصحابی کرام گوتیان ئەی جەماعەتی مسافر. سەرۆکەکەمان دووپشك پێ ی وەداوە. هەر چەند تەداویمان کرد کەلکی نەدا. قەت یەکێك لەئێوە نی یە شتێك بزانێ ژانەکەی ببڕێ. ئەبو سەعید خۆی گوتی با واللە من شتێك دەزانم ژانی ببڕی. بەلام ئێمە ئێمشەو لای ئێوە دابەزین میوانداریتان نەکردین بەکرێ نەبێ تەداویتان ناکەم پێك هاتن لەسەر سێ مەڕ. ئەبو سەعید چووە لای سەرۆکەکەیان. سورەی فاتحەی لەسەر دەخوێندو نەختێ تفی لێ دەدا حەوت جار جێ بە جێ سەرۆکەکەیان بەلای لێ نەما. قەومەکەش حەقەکەیان هێنا کەسێ مەڕەکەبوو. هەندێ لەئەصحاب گوتی یان دابەشی بکەین ئەبو سەعیدی خودری کەسەرۆکی ئەوان بوو. گوتی دەخل مەکەن تادەی بەینەوە خدمەت پێغەمبەر(د). هەتا حیکایەتی خۆمان بەتەواوی بۆ دەگێڕینەوە بزانین فەرمانی لەسەرچی یە. ئنجا هێنایانەوە خدمەت پێغەمبەر (د) حیکایەتەکەیان بەتەواوی بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر (د) فەرمووی بەچیت زانی بەفاتحە شیفای بۆدێ. ئەبوسەعید گوتی خودا خستی یە ناودڵم. پێغەمبەر (د) فەرمووی مەڕەکان لەبەینی خۆتان بەش بکەن کرێ ی دوعا کەوەرتان گرتووە حەلالە. هەتا بەلەطیفە (واتە نوکتە). بۆدڵنیایی ئەوان فەرمووی بەشێکیش بۆمن دابنێن پێکەنی (د).

(ش) لەم حەدیثە زاندرا کرێ وەرگرتن لەموقابەلەی دوعا نووسین یادوعا خوێندن بەشەرع حەلالە. کرێ یەکەش هەر مەخصوص بووە بەوکەسەی دوعا کەی خوێندووە. بەلام پێغەمبەر (د) کەفەرمانی دابەش کردنی کردووە لەبەر ڕەووشت بەرزی خۆی بووە. چونکە ئەصحابەکانی کیرامیش قسەی دابەش کردن لەبەینیان کرابوو. حەزی کرد مەسئەلە لەسەر ئەفکاری ئەوان بێ. ئنجا ئەوان سێ کەس بوون مەڕەکانیش سێ

مەڕ بوون هەریەك مەڕێكی پێ برا.
فەرموودەی پێغەمبەریش كەوتی بەشێك بۆ من دابنێن. مەبەست دڵنیای ئەوان بوو كەباش بزانن حەلالە كریێ یەكەی وەریان گرتووە حەرام نی یە. ئنجا لەمەقامی قسە خۆش كردن ئەمەی گوتووە ئەگەرنا كریێ ی وەرنەدەگرت دروودی خوای لەسەربێ.

## « باب الحوالةِ »

## « باسی حەواله »

٥٩٩ عَن ابي هُريرةَ (ض) مَطْلُ الغَنيّ ظُلمٌ فاْذا اْبتَعَ اْحَدُكُمْ علَى مَليّ فَلْيَتْبَعْ.

### تەرجەمە

٥٩٩ دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر(د) فەرمووی تەفرەدانی پیاو ی خاوەن قەردی دەولەمەند لەلایەن كەسێك كە قەرداری بێ لەپاش داوا كردنی ستەمەو حەرامە. (بەلام ئەگەر قەردارەكە نەی بێ قەردەكە بداتەوە یان خاوەن قەرد قەردەكەی لێ داوا نەكردبێ دواخستنی قەرد حەرام نی یە) ئەگەر پیاوە قەردارەكە خاوەن قەردەكەی حەوالەی پیاوێكی دەوڵەمەند كردبا قبوولی حەوالەكە بكا. (ش) لای ئیمامی ئەحمەد فەرمان بەوجوبە یەعنی قبول بكا بەواجبی. لای مەنەبەكانی دیكە قبوول سونەتە.

٦٠٠ عَنْ سَلمة اْبن الاكوع (ض) هَلْ عَلَيَهِ دَيْنٌ قالوا لا. قالَ فَهَلْ تَرَكَ شيئاً قالوا لا. فَصّلى عليهِ ثُمَ اْتيَ بجنازةِ اْخرى. فقالوا يارَسول اللة صلّ عليها. قالَ هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ قيلَ نَعَم. قالَ فهَلْ تَرَكَ شيئاً قالوا ثلاثة دنانير. فصّلى عليها. ثُمّ اْتيَ بالثالثة. فقالوا صلّ عليها قالَ هَلْ تَرَكَ شيئاً قالوا لا. قالَ فَهَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ. قالوا ثلاثة دنانير. قال . صلّوا على صاحبكُمْ. قال اْبو قتادةَ صلّ عَلَيْهِ يارَسول اللّهِ وعليّ دَيْنُهُ فصلّى عليْهِ.

## تەرجەمە

٦٠٠ دەگێڕنەوە لەسەلەمە کوڕی ئەکوەع ڕەزای خودای لێ بی. گوتی دانیشتبووین لە خدمەت پێغەمبەر (د) جەنازەیەکی یان هێنا پێ یان گوت ئەی پێغەمبەری خودا نوێژی لەسەر بکە فەرمووی ئەرێ قەردی لەسەر هەیە. (ش) چونکی پێغەمبەر(د) لەپێش گرتنی وولاتان نوێژی لەسەر جەنازەی قەردار نەدەکرد بەلکی فەرمانی بەئەصحاب دەکرد نوێژی لەسەر بکەن بەلام لە پاش فتوحات نوێژی لەسەر هەموو. جەنازەیەك دەکرد ئەگەر قەرداریش بوایە خۆی قەردەکەی دەدایەوە. ئەصحابەکان وەلامی یان داوە قەردی لەسەر نی یە. فەرمووی هیچ مالی لەپاش بەجێ ماوە گوتی یان نا. ئنجا نوێژی لەسەر کرد. لەپاشان جەنازەیەکی تریشیان هێنا گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا نوێژی لەسەر بکە فەرمووی ئەرێ قەردی لەسەر هەیە. پیّ‌گوترا بەلێ. فەرمووی هیچی جێ هێشتووە گوتیان سێ دیناری جێ‌هێشتوە ئنجا نوێژی لەسەر کرد. پاشان جەنازەیەکی سێ یەمیان هێنا گوتیان نوێژی لەسەر بکە. فەرمووی هیچ مالی جێ هێشتووە گوتیان نا. فەرمووی قەردی لەسەر هەیە. گوتیان سێ دیناری لەسەرە فەرمووی نوێژی لەسەر رەفیقەکەی خۆتان بکەن. ئەبو قەتادە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا نوێژی لەسەر بکە. من قەردەکەی دەدەمەوە. ئنجا نوێژی لەسەر کرد. ئەم ضەمانە(واتە بەلین دان بەدانەوەی قەردی یەکێکی تر) لای جمهور دروستە بێ رجوع (گەڕانەوە) لەمالی مردوو. لای حەنەفی بەقەدەر میرات ضەمان دروستە ئەگەر بدرێتەوە ئەگەرنا نا چونکی ضامن لەمالی مردوو وەر دەگرێتەوە.

٦٠١ عَن أبي هريرة (ض) قالَ لمّا فَتَحَ اللهُ الفُتوحَ عليه( صلى الله تعالى علية وسلّم) قالَ أنا أولى بالموءمنينَ من أنفُسِهُم. فَمَن تُوُفّي من الموءمنين فتَرَكَ دَيْناً فَعَليّ قَضائُهُ وَمَن تَرَكَ مالاً فلِوَرَثَتِهِ.

## تەرجەمە

٦٠١ دەگێڕنەوە لەئەبو هوریرە(ڕەزای خودای لێ بی) گوتی خودای گەورە وەکوو دەرگەی مەملەکەتانی بۆ پێغەمبەر کردەوە بەسەبەب جیهاد(شەڕ کردن لەگەڵ کافران). پێغەمبەر (د) فەرمووی من باشترم بۆ ئیمانداران لە ڕوحی خۆیان بۆخویان. هەروەکوو لەقورئان دەفەرمووی. (النبی أولی بالموءمنین). ئنجا هەر کەسێك لەئیمانداران وەفاتی کرد. قەردیشی

لەسەر هەبوو من قەردەکەی دەدەمەوە. ئەگەر مالیشی لەپاش بەجێ مابۆ میرات گرەکانی بێ.

٦٠٢ عن جابِرْ (ض) لوْ قَدْ جاءَ مالُ البحريْنِ قَدْ أعطيتُكَ هكذا وَهكذا.

**تەرجەمە**

٦٠٢ دەگێڕنەوە لەجابری ی کوڕی عبداللەی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر مالی بەحرەین هات. (بەحرەین جێگەیەکە لەبەینی بەصرەو عومان). کەعومانیش جێگەیەکە لەرۆخی بەحر. بەلام عەممان شارێکە لە شام). هەردوو دەستەکانی پیرۆزی کردەمست فەرمووی لەو مالە ئاوا پێت دەدەم. ئاوا پێت دەدەم. دوو جار یا سێ جار دووبارەی کردەوە. پاشان مالی بەحرەین پاشی وەفاتی پێغەمبەر هات ئنجا وەکو مالەکەهات حەزرەتی ئەبو بەکر (رەزای خودای لێ بی). فەرمانی دا بانگ ڕابێلن هەر کەسێك وەعدەیەکی یاقەردێکی لای پێغەمبەر هەیە(د) بابێتە لای من منیش خۆم حیکایەتی وەعدەی پێغەمبەرم بۆگێڕایەوە. حەزرەتی ئەبو بەکر بەمستی خۆی مستێکی پیدام ژماردم پێنج سەد درهەم بوو گوتی دوونەمەندەش ببە هەمووی کردی هەزارو پێنج سەد درهەم. چونکی جابر گوتی سێ جار پێغە مبەر (د) فەرمووی ئاوا پێت دەدەم. هەتا هیچ شك لەبە جێ هینانی بەلێن نەمینێ. چونکی ئەبو بەکر دەیزانی ڕەوروشتی پێغەمبەر وابوو وەعدەیەکی دابا بەموطلەقی بەجێ ی دەگەیاند. وەکوو لەجێگای ئەویش دانیشت تەکەفلی کرد ـ واتە کەفالەتی ئەوەی کرد ـ هەموو واجب بەجێ بگەیەنی. هەرشتێکی لەسەری هەبوو لەبەلێن وقەرد.

## « كتاب الوكاله »

## « باسی وەکالەت »

٦٠٣ عَنْ عُقبَةْ أبن عامِر (ض) أنَّ النبيَّ صلى اللة تعالى علية وسلّم أعطاهُ غَنَماً يقسِمُها على صحابتِهِ فبَقيَ عَقودٌ فذَكَرَهْ للنبيِّ صلى اللة تعالى عَلَيهْ وسلّم فقالَ ضحِّ بِهِ أنتَ.

## تەرجەمە

٦٠٣ دەگێڕنەوە لەعوقبەی کوڕی عامر (ض) پێغەمبەر(د) پارچە مەڕێکی دایێ. خۆیو رەفیقەکانی لەپاش دابەش کرنی. بیکەن بەقوربانی. گیسکەکی یەك سالی مایەوە عوقبەش بەپێغەمبەری گوت (د) فەرمووی گیسکەکە تۆبیکوژەوە بەقوربانی.

(ش) عوقبە (ڕەزای خودای لێ بی)- لەلایەن پێغەمبەر (د) وەلەلایەن رەفیقەکانیشی وەکیلی دابەش کردن بوو وەرگیرا لەم حەدیثە شریك لەدابەش کردن دروستە ببیتە وەکیل - بەلآم بەکردنە وەکیل لەلایەن شەریکان.

٦٠٤ عَنْ أبى هُريرةَ (ض) دَعوهُ فأنَّ لصاحِبِ الحقِّ مقالاً. أعْطوهُ سِنّاً مِثلَ سِنّه قالوا يارَسول اللّهِ لانجِدُ الآ أمثَلَ من سِنّهِ فقال أعطوهُ فأنَّ خيرَكم أحسنكم قضاءاً.

## تەرجەمە

٦٠٤ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە(رەزای خودای لێ بی) پیاوێکی جوولەکە هاتە خدمەت پێغەمبەر(د) دەعوای قەردی لێ کرد (قەردەکەش ووشتریك بوو) دەستی بەقارە قارو قسەی توند کرد. رقی خۆی لە پێغەمبەر کردەوە. ئەصحابی کرام ویستی یان ئەزیە تی بدەن و قسەی پێ بلێن لەپاشان لەبەر ریعایەتی ئەدەب دەنگی یان نەکرد. ئنجا پێغەمبەر (د) لەبەر ڕەووشت باشی خۆی و هێزی ئارام گرتنی لەسەر ئەزیەت وجەفای عالەم لەگەڵ تواناشی بۆ تۆلەسەندنەوەو(إنتقام) فەرمووی وازی لێ بێنن بەڕاستی خاوەن حەق لەبەر بەهێزی بەلگەو حوجەتەکانی لەخواستنی حەقی خۆی حەقی قسەی هەیە. حەقی شالآوی هەیە.

(ش) بەلآم بۆ کەسێك عەمدەن تەفرەی بدا وەمامەلەی خراپی دەرحەق بکا ئەو کاتەش نواندنی توندو تیژی یەکە دەبێ لەگەڵ مراعاتی ئەدەبی مەشروع بێ.) فەرمووی ووشترێکی لەتەمەنی ووشتری خۆی بدەنێ گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا هەرچی ووشترێکی لەسالی ووشتری ئەومان هەبێ هەمووی لە ووشتری ئەو باشترە. فەرمووی بیدەنێ بەڕاستی باشترینی ئێوە ئەو کەسەیە قەرد باشتر بداتەوە.

(ش) ئەمە دەلیلە لەسەر دروست بوونی وەکالەت لەدانەوەی قەرد. وە دەلیلیشە لەسەر دروست بوونی وەکالەتی حازر لەمەملەکەت بەبێ عوزر. ئەمە مەزهەبی جمهورە لەشافعی لای إمامی ئەعزەم مە منووعە تەوکیلی حازر بەبێ عوزری سەفەر یاناساغی. یا ڕ ا ز ی بوونی خەصم. ئیمامی مالکیش هەلی واردووە (أستثنای) کردوە. ئەگەر لە بەینی خۆیو

خەصمەكەی دوژمناتی هەبیٚ عوزریش نەبیٚ وەكوو سەفەر وناساغی قەدەغەیە (مەمنوعە).
لەم حەدیثە وەرگیراوە دروست بوونی دانە وەكالەت بە كەسیٚك لەویٚ نەبیٚ. چونكی وەكوو دروست بی كردنی كەسیٚك بەوەكیل كە حازر بی. لەگەل ئەوەی كە موكیل (واتە ئەوەی وەكیل دادەنیٚ) بە نەفسی خۆی. بۆ ئەو كەسەی ئامادە نی یە بە طریق الاولی دروستە لەگەل احتیاج وەبال دانانی وەكیل.
وە ئەمە دەلیلە لەسەر دروست بوونی وەرگرتنی ووشتر وهەموو حەیوانات بەقەرد.
ئەمە قسەی مالك وشافعی وجمهورە حەنەفیش مەنعی كردووە. وەرگرتنی حەیوانات بە قەرد لەبەر زیدەكی. كە زیٚدەكیش لەوانەیە ببی وەلەبەر حەدیثی نەهی لە فرۆشتنی حەیوانات چی بە حازر چی بە قەرد. بەم تەرزە حەیوان بە حەیوان بدریٚ.
ئیمامی شافعی حەدیثی موشعیر بە جەوازو بەنەهی كۆ كردووتەوە. بە حەملی نەهی لەسەر إشتراطی زیٚدەكی لەهەر دوولا. بەحەملی جەوازیش لەسەر لایەنیٚك. لەگەل ئەمە كە حەدیثی نەهی ناسخە بۆ حەدیثی جەواز ـ واتە حەدیثیٚك كەشتیٚك قەدەغە بكا ئەویتریان دروستی بكات. ئەو حەدیثی قەدەغە دەكا ئەو پەیرەوی دەكریٚ. ئەمەیان قسەیەكی احتمالی یە بە احتمالیش نەسخ ثابت نابیٚ لە ریوایەتیٚكی تر جوولەكە كە بە پیٚغەمبەری گوت ـ أَوْفَيْتَنِي وَفي الله بكَ. یەعنی بە تەواوی حەقت پیٚ دامەوە. وە خوداش بە تەواوی حەقی تۆ بەتۆ بدا. ئەم زیٚدەكی‌یە لە رەوشتی باشی پیٚغەمبەرە. لەمەدا هیچ قازانجیٚكی رانە كیشا كە دروست نەبیٚ. كە مەشروط بیٚ لە قەرز وەكوو شەرتی گیٚرانەوەی زیاد لە میقدار. یاخۆ لە صیفەت ئەگەر زیٚدەكی هەبیٚ. بەبیٚ شەرت لەقەرز وەكوو ئیٚرە باشەو سونەتە. بۆ خاوەن قەرديش وەری بگری خراپ نی‌یە.
ئیمامی مالك نەهی كردوە لەو زیادەی كەلە میقداری قەردەكەی زیاترە. ئیمامی شافعیش احتجاجی بە عمومی (فأن خیركم احسنكم قضاءاً) كردووە.
وە ئەگەر لە قەرز ماوەیەك كرایە شەرت كە لكەكی رانەدەكیٚشا بۆ خاوەن قەرد. یاخۆ شەرت كرا لە جیاتی شتی نەشكاو شكاو بداتەوە. یا لەجیاتی باش خراپ بداتەوە. عەقدەكە راستە شەرتەكە لەغوە. چونكی كەلك راكیٚشان بۆ خاوەن قەردنی یە بەلكو بۆ ئەوكەسەیە قەرز وەردەگری.
ئەم عەقدە پیٚی دەلیٚن (عقد الارفاق). گۆیا خاوەن قەرد چاكەیەكە لەگەل قەردار دەكا بەزەیی پیٚدا دیٚتەوە رەحمی پیٚ دەكا.

# «ئەمەش دوعای مترجیمە (وەرگێڕ)

(اللهم ارزقني بجاه من اكتب عنه هذه المشاهدة في حياتي وأمِتني على حبّه وحبّ آله.
واصحابه آمين يا مجيب السائلين.
واتە: خودایە لەبۆ خاتری ئەوەی کەلەسەری دەنووسم ـ کە پێغەمبەرە ـ د ـ ئەم
شوێنە ببینم وەبشم مرێنە لەسەر خۆشەویستی پێغەمبەرو خزم و یارانی ئەو.
ئەوی راستی بێ جەنابی خوا لێخۆشبوو ـ مەلاحسێن شێخ سەعدی ـ لەژیانی خۆی
چوو بۆ حەج لە سالی ١٩٦٠ ئەم شوێنانەی دیت.
خودا لێی خۆش بێ.

«بلاوکەرەوە»



تکایە کاتی خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە راچاوی ئەم هێمایانەی خوارەوە بکەن.

١ـ ض : رضي الله عنه
٢ـ ص : صلى الله عليه وسلم
٣ـ د : دروودی خوای لە سەربێ
٤ـ (خ.ل) : خوا لێی خۆش بێ
٥ـ (ش) : شەرح
٦ـ (ر.ض) : رضي الله عنه

# شعاع شمس الكرد
# في شرح البخاري الشريف

المجلد الرابع

تاليف
ملاحسين شيخ سعدي

تم تاليف الكتاب
سنة ١٩٥٢

كتبه واعده للطبع
المحامي
بشير حسين سعدي

ژمارەی سپاردنی لـە کتێبخانـەی نیشـتمانی
هـەرێمی کوردسـتان (٣٢)ی سـاڵی ١٩٩٤ دراوەتێ

چاپخانەی زانکۆ ـ هەولێر